

عەقید بەکر عەبدولکەریم حەویزی

# گەشتێک بە کۆماری مەهابادا

عەقید بەکر عەبدولکەریم حەوێزی

# گەشتێک بە کۆماری مەهابادا

بیرەوەریەکانم لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا

١٩٤٤ - ١٩٤٧

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
**ئاراس**

زنجیرەی رۆشنبیری

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**
**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**
* * *

کتێب: گەشتێک بە کۆماری مەهابادا
بیرەوەری: عەقید بەکر عەبدولکەریم حەوێزی (رەئیس بەکر)
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٥٨
بەرگ: شکار شێخ عەفان نەقشبەندی
نووسینەکانی بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
پیت لێدان: رەهێڵ رەشید
هەڵە بژێری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
چاپی دووەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە
هەولێر– ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر
ژمارە (١٩١)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ
* * *

# سوپاس و پێزانین

لەو کاتەی کە دەزگای (ئاراس) یادداشتەکانی ماوەی خەباتی نەتەوایەتی و نیشتمانیی عەقید بەکر عەبدولکەریم حەویزیی باوکمان چاپ دەکاتەوە بە دەرفەتی دەزانم کە سوپاسێکی بێ پایانی رێزدار سەرۆک کاک مسعود بارزانی بکەم بۆ پشتگیری کردنی بەرێزیان بۆ چاپ کردنەوەی ئەم کتێبە مێژووییەی کورد کە بە وردی خەباتی نووسەر لە ژێر فەرماندەیی بارزانیی نەمر لەسەردەمی کۆماری دیموکراتیی مەهاباد دەردەبڕێ هەروەها سوپاسێکی زۆری ئەم دەزگا خزمەتگوزارییە ئاراستە دەکەم کە ئەرکی لە چاپ دانەوەی ئەم بەرهەمە خامەی باوکی کۆچ کردوومی گرتووەتە ئەستۆ. هیوادارم هەردەم لە خزمەتی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتیی نەتەوە خەباتگێرەکەماندا بێت

ئەردەڵان بەکر عەبدولکەریم حەویزی
٢٠٠١/٤/١٦
٢٧ی خاکەلێوە ٢٧٠١ی کوردی
هەولێر

## کورتەیەک لە ژیان و بەسەرهاتم

نێوم بەکر عەبدولکەریم عەبدولواحید ئاغای حەوێزییە. ساڵی ١٩١٤ لە گەڕەکی بەفری قەندی شاری کۆیە چاوم بە ژیان هەڵێناوە. خوێندنی سەرەتاییم هەر لەوێ و نێوەندی و ئامادەییم لە ساڵی ١٩٣٢دا لە ئامادەیی نێوەندی لە بەغداد تەواو کردووە.

ساڵی ١٩٣٥ چوومەتە کۆلیجی حربی و لە کۆتایی ١٩٣٦دا بە پلەی (ملازم ثانی) تەواوم کردووە. لەبەر ئەوەی کە خوێندنەکەم بە پلەیەکی بەرز بڕی، بە تایبەتی لە تاقیکردنەوەی سوارچاکیدا یەکەم بووم. خودێ لێخۆش بوو (ملک غازی) زینێکی سواری بە خەڵات پێ بەخشیم.

هەر پاش تەواو کردنی کۆلیج نێردرامە خوێندنگەی (مدفعیە) و بە ماوەی ٦ مانگ تەواوم کرد، دوای ئەوە لە بطریەی چوار لە قەرەغان بە فەرماندەی دەستەی مدفعی دامەزرام. دوای کودەتاکەی بەکر پاشا سیدقی، بطریەکەم گەڕایەوە بۆ فرقەی دووی کەرکووک. سەرکردەی فرقەکە ئەمین زەکی پاشای کورد بوو، جگە لەمە زۆربەی ئەفسەرانی فرقەکەش هەر کورد بوون کە گەلێکیان ناسیار و برادەرم بوون و، پێکەوە خەباتی نهێنیمان دەکرد.

ئەو دەمەی کە لەسەرەتایی کۆیە دەمانخوێند، ژمارەیەک لەمامۆستاکانمان خەڵکی سلەیمانی بوون وەک: ساڵح قەفتان، عەزیز ئەفەندی (ناسراو بە عەزیز قامیشی)، عەلی ئاغا و رەمزی ئەفەندی. ئەوانە مێشکیان بە رێبازی کوردایەتی ئاو دەداین و گۆشەیان دەکردین. هەموو رۆژێک لە قوتابخانە سروودی (ئەی کوردینە، ئەی مەردینە با دەست لە ناو دەست کەین هەموو) لەگەڵ کۆمەڵێک لە سروودی نیشتمانی دیکەمان دەخوێندەوە. کە چووینە بەغداش، لەوێ دیدەنی کورد پەروەران و رۆشنبیرانی وەک ئەمین زەکی بەگ، مارف جیاوگ و هی دیکەمان دەکرد و دەچووینە یانەی سەرکەوتن (نادی ارتقا) گوێمان لەووتوێژەکانیان دەگرت

و مێشکیان زێتر بە کوردایەتی و نیشتمانپەروەریێتی ڕۆشن دەکردینەوە. هەروەها بۆ هەر مـــانگە ئابوونەیان لێ وەردەگـــرتین و دەیان نارد بۆ (کۆمەڵەی خۆیبوون) کە ئەو دەمە لە لوبنان بوو. لە یادمە کە ئابوونەکەی من دوو ڕۆپیەبوو بۆ هەر مانگێک.

کاتێکیش کە بووم بە ئەفسەر، ئەو خەباتەی کە لە سەرەتادا بە هێمنی و لەسەر خۆ دەستمان پێکردبوو، هێدی هێدی گەشەی سەند و، بە تایبەتی لە کۆڕی ئەفسەراندا تێکۆشانی کوردایەتیمان پتر کڵپەی سەند. لە کەرکووکیش پێوەندیم لەگەڵ برا ئەفسەرەکانی حیزبی هیوا دا بەستبوو بە سەرکردایەتی مامۆستا ڕەفیق حیلمی.

ساڵی ١٩٣٩ نێردرامە بەغدا بۆ دەورەی لاسلکی (مخابرە) و بۆ ماوەی شەش مانگ لەسەربازگەی ڕەشید بووم کە ئەو کاتە مەنتەقەی عورفی بوو.

ڕۆژێک دوو ئەفسەری دەورەکەمان بێ ئەوەی هیچ موناسەبەیەک هەبێت لە کـاتی پشـــوودانـدا و بە دەنگێکی بەرز جنێـــویان بە کـــورد و مـــەلا مـســـتـــەفـادا. یەک لەو دوو ئەفـســـەرە کـوڕی سـەرەک دادگـای تەمـیــز (عەبدولرەزاق ئەحمەد تەها) بوو، کە پشوو تەواو بوو چووینە پۆلەکەمان، مامۆستا پرسیارێکی لێکرد، بەڵام ئەو نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە. منیش بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد و گوتم کە ئەو گێلە کەللە پووتە چ نازانێت. ئەویش بە تووڕەییەوە جنێوێکی پێدام، منیش هەڵمەتم بۆ برد و دەستم بە لێدانی کرد. پاش ئەوە بە کـاتژمێـرێک لە لایەن فـەرماندەی سەربازگەوە (کامل شەبیب - یەکێک لەو ئەفسەرە یاخیبووانەی دوای شەڕی ١٩٤١ کە لەگەڵ صلاح الدین صباغ بوو، لە سێدارە درا) بڕیار درا کە (حجزی ثکنە) بکرێم، واتە لەســەربازگــە دەرنەچم تا دەردرێمــە دادگـا. دیار بوو نیازیان گەلێک خراپ بوو، دەیانویست ئەنجومەنێکی لێکۆڵینەوە لە دادگا دژم دابنێن و جگە لەوەی کـە لە سوپا دەربکرێم چەند سـاڵێکیش زیندانی بە تەنگەما بدەن. بەڵام خۆشبەختانە زۆربەی ئەفسەرە کوردەکان کەوتنە خۆ گورجکردنەوە و تەقەلا دان، بە تایبەتی بەڕێوەبەری بزووتنەوەکان (مدیری

حەرەکات لە وەزارەتی بەرگری) نورەدین بەگ مەحموود و فەرماندەی کۆلیجی ئەرکان بەهادین بەگ نوری کە ئەم دووانەش کورد بوون و پلەو پایەیان گەورە بوو. ئەوراقی لێکۆڵینەوەیان کیشایەوە بۆ دادگای سەربازی لە وەزارەتی بەرگری سەرۆکی ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە و کۆڵۆنێل (عەقید)ێکی کورد بوو کە برای حاجی رەمەزان پاشا بوو. دادگا بڕیاری دا کە ماوەی (٧) رۆژ مەعاش لەمن ببڕدرێ و لە دوو ئەفسەرەکەی دیکەش (٤) رۆژ مەعاش بڕین لە هەر یەکەیان. شایانی باسە کە هەر هەمان ساڵیش کرام بە (مولازم ئەوەڵ). لە راپەرینی مایسی ١٩٤١دا کە بە (راپەڕینی رەشید عالی) نێوی رۆیشتبوو، بطریەکەی ئێمە کە لە لیوای ٣ی سەحرا بوو نێردرام بۆ (سرسن الذبان – حبانیة) بۆ شەڕی ئەوێ.

لەوێ لە ئەنجامدا سوپای عێراقی شکستی هێنا و بەرەو دوا هەڵات. سەرجەمی ئەفسەرەکانی لیواکەمان کە لە فەلوجە بوو سەربازەکانیان جێ هێشت و هەڵاتن. تەنیا من کە جێگری فەرماندەی بطریە بووم لەگەڵ عەبدولرەحمان قازی کە فەرماندەی دەستە (فصیل) بوو لە بطریەی ٣ ماینەوە و لیواکەمان بەرەو (ابو غریب) کە نێزیکی بەغدایە کێشایەوە.

لەساڵی ١٩٤٣دا کە راپەرینەکانی بارزان دەستی پێکردەوە، ئێمە ژمارەیەک ئەفسەران لەماڵی (مقدم ئەمین رەواندوزی) کۆ ببوینەوە و سەبارەت بە بارودۆخی کوردستان و بە تایبەتی بارزان دەدواین. لە ناکاو وەزیری دەوڵەت ماجید بەگ مستەفا پەیدا بوو کە لە لایەن حکوومەتی بەغداوە نێردرا بوو بۆ وتووێژ و رێکەوتن لەگەڵ مەلا مستەفادا لەسەر ئەساسی مافی ئۆتۆنۆمی. هەر هەمان شەو وەڵامان بۆ مامۆستا رەفیق حیلمی نارد کە بێتە کەرکووک، مامۆستا رەفیق حیلمی و ئێمەی ئەفسەران پێکەوە لەگەڵ ماجید بەگدا هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە سەبارەت بە مەسەلەی کورد وتووێژمان کرد و کۆمەڵێک لە بیر و راو پێشنیازی باشمان داین.

رۆژی دوایی تاکو هەولێریش لەگەڵ ماجید بەگ رۆیشتم، بەڵام زێدەتر

نەمتـوانی لەبەر ئەوەی کـە خێزانەکـەم نەخـۆش بوو، دەبووایە بمبـردایە بۆ لوبنان. هەر لەوێ گـەڕامـەوە بـەغـدا و لەوێشـەوە چووین بۆ لوبنان. لەوێ نەخۆشەکەم بەجێهێشت و خۆشم گەڕامەوە.

ئەو دەمە سالّی ١٩٤٣ پلەی ئەفسـەریم ببوو بە رەئیس (نەقیب) داوام کرد کە لە سوپا بکێشرێمەوەو (استعفا) بکرێم؛ چونکە لە راستیدا نیازم هەبوو پێـوەندی بەراپەڕینی بارزانەوە بکەم و، دوا بە دوای ئەوەش بیـرم لەوە کردبووەوە بەرەو مەهاباد بچم.

لە ئەنجامدا هەلاّتم و چوومە گوندەکەی خۆمان (شێواشان - کەوتووەتە بناری چیای هەیبەت سولّتان لە نێوچەی کۆیە)، لەوێ چەند کەسێکم لای خـۆم چەکدار کـردبوو. شـەوێک بەرەو نێـزیکی کۆیە هاتم، هەر ئەو شـەوە خالّۆزایەکم (موحسینی عەزیز ئاغا) تازە لاو بوو، بەنهێنی خۆی گەیاندە لام و ئاگـاداری کـردم کە ئەفسـەرێک بەنێـوی (مـەهدی حـەمـیـد) چووەتە مـالّیـان و دەیەوێ چاوی پێم بکەوێ. بێ ئەوەی کـەسێک پێـبـزانێ خـۆم گـەیاندە مـالّی خالّم (عـەزیز ئاغـا). پاش دەمـەتەقێ و لێـدوانێکی تێـرو تەسەل، ئەفسەری ناوبراو بڕیاری هەلاّتنی داو، لەگەلّ مندا پێکرا دەست بە خـەبات کردن بکـەین، لە هەمـان کاتدا دەیویست چەند کـەسێکی دیکەش ببینێ. منیش هەر ئەو شەوە ئاگاداری کاکەی حاجی مەحموود و، مامۆستا سابیر ئیسماعیل و عەبدولحەمیدی حاجی تۆفیق و کاکە زیاد ئاغام کرد کە بێنە مالّی خالّم. جگە لە کاکە زیاد ئەوانی دیکە هەموو هاتن. سەر لە نوێ وتووێژ و دەمە تەقێکەمان گەرم کردەوە. لەو دانیشـتنەدا پێشنیـازی بەندە ئەوە بوو کـە ژمـارەیەک چەک و تـەقـەمـەنی بکڕین و راپەڕینێک لە بیـتـوێن و دەشـتی کـۆیە دژی عـێـراق دەست پێ بکەین و مـەبەسـتم لەو مـەسـەلەیە ئەوە بوو کە بتـوانین کـەمێک فـشـاری سـوپای عـێـراقی لەسـەر نێوچەی بارزان کەم بکەینەوە. بەلاّم مەخابن مامۆستا سابیری لێ کەنار خەی ئیدی سەرپاکی دیکەیان دژی پێشنیـازەکەم بوون، چونکە هەموویان بازرگانێتی تووتنیان دەکرد و بەرژەوەندییان لە بیتوێندا هەبوو.

ڕۆژی دوایی ئەو کۆبوونەوەیە، مامۆستا سابیر لە یانەی کۆیە (نادی کۆیە) مەست دەبێ و بەو خەیاڵەوە باسی دانیشتنەکەی شەوی رابوردوو دەدرکێنێ، هەر دوای ئەو هەمو برادەران بە کاکەزیادیشەوە حەواڵەی عورفی دەکرێن، بەڵام لە رێی سەعید بەگ قەزازەوە هەموویان بەرەڵڵا دەکرێن، جگە لەمەهدی حەمید نەبێ کە ماوەی پێنج ساڵ زیندانی بەتەنگەدا دەدرێ.

پاش ئەوە بە ماوەیەک بۆ هەمان مەبەست چووم بۆ بیتوێن و چاوم بە عەباسی مامەنداغای ئاکۆ کەوت و، سەر لە نوێ باسی هەڵگیرسانی راپەرینم لەگەڵدا کرد لە نێوچەی بیتوێن تا لەو رێیەوە بتوانین یارمەتییەکی بزووتنەوەی بارزان بدەین. بەڵام وەڵامی عەباس ئاغا لەو بارەیەوە بەم جۆرە بوو: "ناخۆشیمان لەگەڵ جەماعەتی کۆیەدا هەیە (مەبەستی کاکە زیاد ئاغا) بوو. ئەگەر ئەوان لە نێوچەی کۆیەدا بتوانن کارێکی وا راپەرێنن ئەوا من ئامادەم لە نێوچەی بیتوێندا راپەرینێکی یەکجار گەورە دژی رژێمی میری بەرپا بکەم".

بەڵام وەک لەمەوبەر ووتم کۆیە پێشنیازەکەی بەندەیان پەسەند نەکرد. مانگێک تێپەری کرد بوو بەسەر ئەو مەسەلانەدا، بریارم دا سەردانێکی سولەیمانی بکەم. لەوێ چوومە مالی خەزوورم (سەبری عەبدوڵڵا - بەرێوەبەری پۆلیسی سولەیمانی)، خەزوورم ئەو دەمە لەوێ نەبوو، بەڵکو چوو بووە لوبنان و تەرمی خێزانەکەمی هێنابووە بەغدا و لە (مەرقەدی حەزرەتی گەیلانی) بەخاک سپێردراوە. ماوەی دە رۆژێک لەوێ مامەوە و لەو ماوەیەدا گەلێک لە برادەران و ئەفسەران دیدەنییان دەکردم رۆژێک مقدم ئەمین رەواندوزی هاتە دیدەنیم و پێی ووتم: " دەزانی کە مستەفا خۆشناو و میرحاج ئەحمەد لە لایەن کۆمەڵەی هیواوە مۆڵەتیان پێدرا و نێردرانە مەهاباد، بەڵام لە گەرانەوەیاندا میرحاج لەموسڵ گیراوە و مستەفا خۆشناویش هەڵاتووە.. ئێستە دەمانەوێ تۆ بۆ مەهاباد بچیت، بەڵام بە مەرجێک کە هیچ کەسێک دەرکی پێنەبات، چونکە بازێری

مەهاباد پڕە لە سیخوڕی بەریتانیا، ئەمریکا، رووسیا، تورکیا و گەلێک شوێنی دیکە. لەبەر ئەوە بۆ ئێمە چاک نییە کە پەی بە پێوەندییەکانی ئێمە و کۆمەڵەی (ژ. ک) ببەن".

هەر پاش ئەوە خەزوورم تفەنگێکی برنەوی گەلێک نایابی دامێ و لە سولەیمانیەوە گەڕامەوە دەشتی کۆیە. پاش مانەوەم لەوێ بە دوو هەفتەیەک نامەیەکم لەمامۆستا خۆشناوەوە بە دەست گەیشت لەوێدا نووسیبووی:

"کاکە من ئێستە لە گوندی ئەنگۆزم لە نێزیکی بێتواتە، دەمەوێ چەکێک پەیدا بکەم و ئەوجا دێمە گوندی شیواشان بۆ لات". بەڵام وا پێدەچوو کە هەر لەوێوە بۆ بارزان رۆیشتبوو. پاش ئەوە بە ماوەیەک نامەیەکم لە (رەئیس ئەوەڵ روکن عیزەت عەبدولعەزیز ئاغا)وە بەدەست گەیشت وە نووسیبووی: "من لە شوێنی خۆم هەڵاتووم و لە گوندی بێستانە چاوەڕوانت دەکەم پێکەوە بەرەو بارزان بچین" بەڵام مەخابن لەبەر نەشارەزایی تەتەرەکە ڕێی هەڵەکردبوو، بۆیە رۆژێک درەنگتر نامەکەم گەیشتە دەست.

کە چوومە بێستانە رەئیس عیزەت لە ڕێی شەقڵاوەوە رۆیشتبووە بارزان. دوای ئەوە بە سێ هەفتەیەک نامەیەکی دیکەم لە کاک عیزەتەوە گەیشتە دەست و داوای کردبوو کە بچمەص پژدەر بۆ لای عەباسی مەحموود ئاغا و بابەکری سەلیم ئاغا (ئەو دووانە سەرکردەی هەردوو تایفەکەی پژدەرن) و داوایان لێ بکەم کە ئەوانیش پاڵپشتی لە داخوازییەکانی بارزان بکەن سەبارەت بە خودموختاری کوردستان. گەلێکم پێخۆش بوو کە بتوانم لەگەڵ ئەو دوو سەرکردەیەی پژدەردا کارێکی نیشتمانی ئەنجام بدەین، بۆیە بەرەو مەرگە رێکەوتم و چاوم بە پیرۆت ئاغا کەوت و، رۆژی دوایی چوومە نورەدین و لەوێ چاوم بە باپیراغای نورەدین کەوت، کە لاوێکی نیشتمانپەروەری تێگەیشتووی ژێهاتی و سەرۆکی کۆمیتەی پژدەر بوو. لەوێشەوە چوومە گوندی (چۆم خرکە) کە نێزیکی قەڵادزێیەو ماوەی ٥ رۆژێک لای عەباس ئاغا مامەوە و هەر لەوێشەوە پێوەندیم بە بابەکراغاوە

کرد. بەڵام لەو کاتەدا نێوانی ئەو دوو سەرکردەیەی پژدەر وا تێکچووبوو کە سەنگەریان لە یەکدی گرتبوو، بۆیە داخی گرانم ویستەی دڵم لە یەکخستن و یەکێتی هێزەکانی کورددا لە پاڵپشتی کردنی بزووتنەوەی بارزاندا بە ئاوات نەگەیشت لەوێوە بە ناهومێدی بەرەو گوندی شیواشان گەڕامەوە.

هەفتەیەک تێپەڕی نەکردبوو بە سەر مانەوەماندا لەوێ، شەوێک لە ناکاو دەورەوبەری سەد پۆلیسێک ئابلۆقەی گوندەکەیان دا. بەڵام من شەوانە دەچوومە قەراخ گوند و لەسەر تەپۆڵکە شاخێک لێی دەنوستم. لەبەرەبەیاندا تەقوتۆق دەستی پێکراو پاش کاتژمێرێک شەڕ کردن من بریندار کرام و، ناچار لەگەڵ چەکدارەکانمدا پاشەوپاش بەرەو بەرزاییەکانی چیا کشاینەوە. پۆلیسەکان ماڵیان بە تالان بردم. ماوەیەک برینەکانم کەمێک سارێژ ببوون و لەگەڵ کاروانێکی قاچاخچیدا کە هاتوو و چۆی کوردستانی کوێستانیان دەکرد خۆم گەیاندە مەهاباد. بە هەمووی دوو هەفتەیەک دەبوو لەمەهاباد بووم کە ئاڵای کوردستان بلند کراو دامەزراندنی کۆماری کوردستان ڕاگەیاندرا.

## هێنانی بارزانییەکان بۆ مەهاباد

هەر هەمان ڕۆژ مەلا مستەفا رایسپاردم کە بچمە شنۆ و ئەو بارزانیانەی کە لەوێ بوون، لەگەڵ ئەفسەرەکان و برادەرانی دیکەدا بیانهێنم بۆ مەهاباد لە شنۆ هەموو بارزانییەکان و ئەوانی دیکەشم کۆکردەوە کە بە ژمارە ٧٠٠ تا ٨٠٠ کەس دەبوون، دوو ئەسپی ماڵی مەلا مستەفاش هەبوو شتومەکم لێ بار کردن و وێکڕا بەرەو نەغەدە رێ کەوتین و لەوێشەوە بۆ مەهاباد. بێگومان ئەو ژمارە زۆرە، کەمیی جێ و رێی دروست کردبوو راستییەکەی خەڵکی مەهاباد زیاد لە پێویست کۆمەکیان پێکردین، ئەم هێنان و بردنە چەند رۆژێکی برد و پاشان توانیمان جێی خەوتن و دانیشتنیان لە هەندێک مزگەوت و خانووبەرە بۆ جێ بەجێ بکەین و مەسەلەی خۆراکیشیان بۆ جێ بەجێ کرا. ئەرکێک لەسەر شانی من بوو، درێغیم نەدەکرد، هەمیشە بەسەریانەوە دەگەڕام، لە هەموو پێویستییەک مەلا مستەفا و لێپرسراوانی کۆمارم ئاگادار دەکردەوە، ئەوانیش بەپێی توانا چارەی گیروگرفتەکانیان دەکرد. جێگەشمان بۆ نەخۆشەکان ساز کردبوو. دوو کەسمان لە نەخۆشخانە دیتەوە کە وەک جێگری پزیشک (موظف صحي) کاریان دەکرد، و سەرپەرشتی نەخۆشەکانمان پێ سپاردن.

چەند حەفتەیەکمان بەو چەشنە گوزەراند. رۆژێک پێشنیازێکم لای مەلا مستەفا کرد. کە ئیدی بێ ئیش و کار هەر وا کات بەسەر نەبەرین، بەڵکو چێتر وایە ئەو بارزانییانەی کە چەکدارن مەشقی سەربازییان پێ بکرێت. مەلا مستەفا بە پیر پێشنیازەکەمەوە هاتو بڕیاری دا کە دەوروبەری ٢٠٠ بارزانی چەکدار بۆ ئەو مەشقکردنە ئامادە بن. ئیدی لەوە بە دوا رۆژانە پاش نیوەڕۆ دەچووینە سەربازخانە چۆڵەکەی دەرەوەی مەهاباد و پۆل پۆل رێکم دەخستن. ئەو کەسانەش کە لە سوپای عێراقیدا سەربازییان کردبوو، کردمن بەسەر قۆڵ (آمر حضيرة). بێگومان هەموو ئامادەکردن و مەشق پێکردنێکیان لەسەر شێوەی مەشقی عێراقی بوو، بەڵام بەکوردی

فێر دەکران، بۆ وێنە "تفەنگ لەسەر شان بنێ، بۆ لای راست وەرگەڕێ، تا ئەوێ..". بێگومان لەسەرەتادا من بە تەنیا لەگەڵیاندا خەریک بووم، بەڵام پاش ئەوەی کە ژمارەی بارزانی‌یەکان زێتر بوون، ئیدی بە تەنێ ئەو کارە بەمن بەڕێوە نەدەچوو، لەبەر ئەوە کاک جەلال ئەمین و کاک خێروڵلاش یارمەتیان دەدام.

بە بۆنەی کردنی بەڕێز پێشەوا قازی محەمەد بە سەرۆک کۆمار، ژمارەی (١٥٠) کەسم لەو بارزانی‌یانەی کە بەتەواوی و بە باشی فێری مەشق کردن ببوون، هەڵم بژاردن و کردمن بە (حرس شرف).

رۆژی دووای دامەزراندنی کۆمار چوومە لای مەلا مستەفا بۆ شنۆ لەو رۆژە پیرۆزەدا بڕیار درا کە لە شەقام و گۆڕەپانی چوارچرا دا گشت ئامادە بین. بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی پێشەوامان دەکرد. کە تەشریفی گەیشت لەگەڵیدا بەڕێز مەلا مستەفا، حەمە حوسێن خان، قاسم ئاغای ئێلخانی، جەعفەر ئاغای کەریمی و گەلێک لەسەرەک هۆز و دانیشتوانی مەهابادی لەگەڵدا بوو.

سەر شەقام و خانووەکان پڕ بوون لە ژن و منداڵ و هەر کە پێشەوایان بە بەرگی رەسمی‌یەوە بینی لە خۆشیدا بە خوڕ فرمێسکی شادمانی لە چاویان دەباری. هەر لەوێدا فەرمانم بە (حرس شرف)دا و سەلاوی کۆماری‌یان پێشکەش بە بەڕێز پێشەوا کرد. پێشەوا وەستاو سلاوی پێشکەش بە جەماوەری ئەوێ کرد و چەپڵە ڕێزان و هەلهەلە و دروشم بەسەر ژیانی پێشەوا و کورد و کوردستاندا، لە هەموو ئەو ناوە بەرز ببووەوە.

حەرەسی کۆماریش کە بە درێژایی شەقامەکە وەستابوون، بەڕێز پێشەوا بە بەردەمیاندا هات و وێستگەیەکی کرد و رووی کردە بارزانی‌یەکان و سوپاسی کردن و فەرمووی: "سەرمان بڵندە پێتان، جێی شانازیمانن، ئێوەن نموونەی خەباتی پاڵەوانانەی کوردایەتی، سەد سوپاس بۆ ئێوە و سەرۆکتان مەلا مستەفای بەڕێز". ئەوجا رووی کردە جەماوەر و ئەو ووتارەی پێشکەش کردن:

"ئەی جەماوەری کورد، ئەی بەچکە شێرانی کورد سڵاوتان لێ بێت. ئەو ئەرکە گرنگەی کە ئێوە بە منتان سپاردووە، داوا لە خوای مەزن و ئێوەی جەماوەری کورد دەکەم کە یارمەتیم بدەن تاکو بتوانم هەتا سەر ئەم کارە بۆ بەرژەوەندی میللەتەکەم بەرمە سەر و بەرامبەر بە ئێوە و خوای مەزن، خەجاڵەت نەبم.

دوژمنانی کورد گەلێک زۆرن، لە هەموو ئەو راپەڕینانەدا کە لە پێناوی مافی رەوا و سەربەخۆییدا کردبێتی، دوژمنان لە هەر چوار پارچەی کوردستان یەکیان گرتووە و بە هەموو رێگەیەک بەرهەڵستیان لەو مافە کردووە و بەردەوام راپەڕینەکانیان بە چەتەگەری پێشان داوە تا پتر رێ خۆش بکەن و دڕندانەتر و نامرۆڤانەتر لە نێومان بەرن.

بەڵام عەدنان مەندریسی فاشست دەبێت ئەمجارە ئەوە چاک بزانێت ئەو چرایەی کە کورد هەڵیکردووە بە پڕوپاگەندەی خۆی و دۆستەکانی ناکوژێتەوە. ئەم گەلە نەبەزە فێرە لە رێگەی نیشتمانیدا قوربانی بدات و لە هەڕەشە و خۆ گیڤ کردنەوەی ئەو ناترسێت ئەم گەلە ووشیارە و چاک دەزانێت کە هەزاران رۆڵەی لە رێگەی ئازادی کوردستاندا بە شەهید داوەو بە خوێنی ئەوان شاخ و کێوی کوردستان ئاو دراوە و شین بووە. هەموو کوردێک ئەوڕۆ لەسەر رێگەی پیرۆزی ئەوان خەبات دەکەن و خۆ بەخت دەکەن بۆ پاراستنی ئەو چرایە و تا پتر شەوقی پێ بدەن. جا عەدنان مەندریسی خەیاڵی خاوە و دەبێت ئەو راستییەش چاک بزانێت. ئومێدەوارم بە پشتیوانی خوای مەزن کە ئاڵای سەربەخۆیی و چرای ئازادی لە هەر سێ پارچەکەی دیکەی کوردستاندا وەک مەهاباد هەڵدەکرێت و لە بەرزییدا دەشەکێتەوە".

جەماوەری مەهاباد ئەو رۆژەیان بە ئاهەنگ و شایی بردە سەر...

سەرەتا لە سوپای کۆماردا وەک سەرلک (ئامر فەوج) دانرام و، چوومە (جەبهەی سەقز). دوای شەڕی (قاراوا) پلەی پۆدپۆڵکۆڤنیک (مقدم)م پێدرا. دواییش کرامە فەرماندەی (جەبهەی سەردەشت و بانە).

پاشی دارمـانی کۆماری کـوردسـتـان، ئێـمـه چەند مـانگێک هەر لە شەڕ دابووین لە نێوچەکانی – شنۆ، مەرگەوەڕ تا سەر چۆمی گادەریش چووین. وەک دەزانین کە دوای نەمانی کۆمار (مەلا مستەفا) لە تاران لەووتووێژدا بوو و، پێم وا بوو ئەو پەیمانەی کــە ئەمــریکا بە بارزانی دابوو بەڕاست نەدەگەڕا. هەر لەسەرەتاشەوە من پێشنیـازی ئەوەم کردبوو کە بەرەو رووسیا بچین. تا لە ئەنجـامـدا وای لێـهـات هەڵوێست بەرانبـەر بۆچوونـەکانی من وەربگیرێ و مەلا مستەفا لە تاران گەڕایەوە و بەرەو رووسیا رۆیشت.

لەســەر چۆمی گـادەر من و ۲۲ کـەس پێکەوە بووین. لەوێ مـحـەمـەد قـودسی و جـەلال ئەمین بەگـیـشـمـان لەگـەڵدا بوون. لە ئەنجـامی سێ رۆژ رۆیشـتندا بەبێ هیچ خـۆراکـێک لە چیـاکـانی نێـوان هەردوو کـوردسـتـانی گەرمیان و کوێستاندا رێگەمان لێ وون بوو. کە نێزیکی گوندی (خنێرە) بووینەوە لە نێــوچەی لۆلان و برادۆست، لەوێ قــودسی لەســەرمــان و لە برسـێـتـیـدا هێـزو توانای نەمـا و پێی ووتین کـە خـۆی تەسلیم دەکـاتەوە و لەوێڕا جەلال ئەمین و چەند کەسێکی دیکەشی لەگەڵدا رۆیشت. ئاکام ۷ کـەس مـاینەوە و رووممان لە رۆژهەڵات کرد و چیـا بەچیـا رۆیشـتین. پاش مـاوەیەک جەلال ئەمین بەگ پەژیوان دەبێتەوە و بەرەو دوا دەگەڕێتەوە. لە گەڕانەوەدا تووشی هێزێکی ئێرانی دەبێت و خۆی تەسلیم دەکات.

ئەو ۷ کەسەی کە مابووینەوە چواریان لەمن بە هێزتر و خۆشڕەوتر بوون، پێشـمـان کەوتن و ئێـمەیان جێـهێشت. مـاینەوە ۳ کـەس: بەندە و عـەزیز قالەڕەش و عەبدولواحید کە هەردووکیان خەڵکی کۆیە بوون، رۆژی چوارەم عـەبدولواحـید لەسـەرمـان و لە برسێـتـیـدا گـیـانی پاکی بە خـاک سپـارد. پێنجەم رۆژ بۆ ئێـوارەکەی گەیشـتینەوە نێوچەی شنۆ. سەری چیا بە بەفر داپۆشرابوو، دامێنیـشی سەوزایی خۆش بوو. شەو خۆمـان کردە گوندێکەوە، بەڵام بەر لەوەی بگەینە نێو گوند تووشی یەکێک هاتین و بردینی بۆ مـاڵی کوێخا. ئەو کابرایەش هەر کوڕی کوێخا دەرچوو.

کوێخا نێوی سۆفی شوکر بوو، لە کاتی خۆیدا کە رەشید عالی گەیلانی

لە عێراق بەرەو ئێران هەڵاتبوو، ئەم سۆفی شوکرە لە ئێرانەوە بردبووی بۆ تورکیا. کارتێکی رەشید گەیلانی پێبوو، کە لەوێدا گەیلانی نووسیبووی: "ئەو زاتە منی لەمردن رزگار کردووە. لە هەر کوێ بم دەتوانێ بێ پەروا بێتە لام و کەس رێی لێ نەگری". دوو رۆژ کوێخا لەماڵەکەیدا حەشاری داین و گەلێکیش خزمەتی کردین. دەوروبەری ئەو گوندانە بە سوپای ئێرانی تەنرابوون، هەر کەسێکی عێراقییان بدیتبا دەستوبرد دەستگیریان دەکرد.

ماڵی کوێخامان جێهێشت و بەرەو گوندی زێوە کە دەکەوێتە سەر هەمان رووباری گادەر لە نێوچەی (سیلۆێ) بە رێکەوتین و شەو گەیشتینە ماڵی کوێخای گوند.

کوێخای گوند عەزیزی برادەرمیان دەناسی. ئەو چوار برادەرەی کە لەمەوبەر باسم کرد لێمان جودابوونەوە هاتبوونە هەمان گوند. کوێخایان لەوە ئاگادار کردبوو کە رەئیس بەکریان لەگەڵدا بووە و لەگەڵ دوو کەسی دیکەدا لە ناو بەفردا نەماون خەڵکی گوندەکەش بە درێژایی رۆژێک بە شوێن تەرمەکاندا گەرا بوون. ئەو شەوە عەزیزی برادەرم منی ئاشکرا کرد، کوێخا و منداڵەکانی زۆر خۆشحاڵی خۆیان پێشان دا کە من ماوم و، بە چەشنێک خزمەتیان کردبن کە دەتوانم بڵێم هیچ کەسێک لە خزم و براو خۆشەویستان بە ئەندازەی ئەوانیان بۆ نەدەکردین. سێ رۆژێک کوێخا لای خۆی گلی داینەوە و پاشان هەر خۆشی لەگەڵماندا بەرێکەوت و تا کوێستانی خەیلانیان (لەسەر چیایەکە و بەسەر رایاتدا دەنوارێ و کەوتوونەتە کوردستانی گەرمیان) هات. تکایەکی یەکجار زۆرمان لێکرد کە ئیدی پێویست بە ماندوو بوون ناکات و بەرەو ماڵی خۆی بگەڕێتەوە خۆ ئەگینا بە نیاز بوو تا رایاتیش لەگەڵمان بێت. لە چیاوە بەرەو رایات هاتین. لە رێ کردی بە زریان و بەفرێکی وا وەختابوو تەواو پەرێشانمان بکات. نێزیکی بەرەبەیان گەیشتینە رایات، لە تاوی سەرما چووبوومە گۆلە ئاوێک، عەزیزیشم نارد بۆ ماڵی ئەمین ئاغای رایات تا ئاگاداری

بکات و بێت بە نهێنی بمگەیەنێتە ناو گوند، چونکە پۆلیسخانەی لێبوو. هەواڵ و زانیاریشم گەیشتبووە دەست لەوەی کە شەش مەفرەزە لە نێوچەی رایات و گەلاڵە لێم دەگەڕێن. ئەمین ئاغای عەلی ئاغای رایات کە دۆستایەتی لەوەبەرم لەگەڵیدا هەبوو و بۆ من وەک برا وا بوو، کوردێکی یەکجار دڵسۆز و نیشتمانپەروەر بوو.

لێرەدا نامەوێ درێژە بەو باسانە بدەم تا دەرفەتێکی دیکەم بۆ دەرەخسێ. لەوێوە خۆم گەیاندەوە گوندەکەی خۆم (شیواشان) و ٢٢ رۆژ بەرێوە بووم. گەیشتبووینە گوندی زارگەڵی کە میرحەمەی زارگەڵی دەیویست بمانگرێت و بماندات‌ەوە دەست حکومەتی بەغدا، بەڵام یەکەمجار بە زەحمەت توانیمان خۆمان لە دەستی رزگار بکەین.

لە شیواشان تاکوو ساڵی ١٩٥٤ بە هەڵاتوویی مامەوە، پاش ئەوە حکومەتی عێراق پۆلیسخانەیەکی لە گوندەکەم کردەوە و ناچار چووم بۆ داریکەلی بۆ لای مەلیک مەحمودی حەفیدی نەمر. شێخی نەمر ٨ مانگ تێکۆشا تا ئەو پۆلیسخانەیان لە شیواشان لابرد، ئەوجا گەڕامەوە و تا ساڵی ١٩٥٧ لەوێ بووم. بەر لەمە شێخی نەمر هەوڵی گەلێک دا لە رێی پارێزگاری سولەیمانییەوە (خوالێخۆش بوو عومەر عەلی) تەسلیم بە حکومەت ببم. لەمانگەکانی دوای ساڵی ١٩٥٧وە خۆم لە سولەیمانی تەسلیمی دەسەڵاتدارانی حکومەت کرد. لە حامیەی سولەیمانی ماوەی ٢٠ رۆژ وەک (مەوقوف) مامەوە و وەک هەر ئەفسەرێکی دیکەی ئەوێ مامەڵەم لەگەڵدا دەکرا.

لەلایەن فەرماندەی حامیەوە (عەقید مەجید عەلی) برادەرم و ئەفسەرەکانەوە ژووری جێگری فەرماندەی حامیەم بۆ تەرخان کرابوو. پاشان هەواڵەی بەندیخانەی مەرکەزی بەغدا کرام. لەوێش لەسەر داوای وەزیری ناوخۆ خودا لێخۆشبوو سەعید بەگ قەزازەوە لە دایەرەی بەندیخانەکە ژوورێکیان بۆ تەرخان کردم و یەکێکیشیان دانا خزمەتم بکات.

ئەفسەر و ناسیاو دۆستانی ئەو دەمە رۆژانە دەهاتنە لام و ژوورەکە وەک دیوەخانی لێهاتبوو. دەوروبەریان چۆڵ نەدەکردم. ماوەی ٣ مانگم لەوێ بەو چەشنە بردە سەر، دوای ئەوە لە هەولێر دادگایەکی عورفیی تایبەتیم بۆ دانرا و لە ئەنجامدا بەرەڵا کرام.

پاش بەرەڵا بوونم، بڕیارم دا بچمە بەغدا بۆ سەردانی سەعید بەگ لەوەزارەتی ناوخۆ کە سوپاسی بکەم. لە خزمەتی سەعید بەگدا پارێزگاری هەولێریش رەشید نەجیبی لێبو. دوای پێشکەش کردنی رێز و سوپاسم بۆی، کەوتینە و توێژ کردن و، سەعید بەگ فەرمووی: دەمانەوێ بگەڕێیتەوە ریزی سوپا و بە پلەی هەمان ئەو ئەفسەرانەی سەردەمی خۆت کە ئەورۆکە گەیشتوونەتە چ پلەیەک تۆش هەمان پلەی سوپاییت پێ ببەخشرێت.

شایانی باسە کە ئەو دەمە هاوەڵەکانم لە پلەی سوپاییدا گەیشتبوونە زەعیم (عەمیدی ئێستە)، لەوەڵامدا پێم ووت: بەڕێزم، من کاتی خۆی لەم حکوومەتە یاخی بووم و چەکم دژی هەڵگرتبوو، ئەوجا ئێستە چۆن دەتوانم بچمەوە رێزی هەمان سوپا. خۆ ئەگەر وا بکەم ئەوا ئەو راستییە دەسەلمێنم کە یان جاری پێشوو دەبێت لەگەڵ خۆم راستگۆ نەبووبێتم لە سوپادا یاخود ئەورۆکە بێ هەڵوێست و ناراستگۆم گەر بچمەوە نێو ئەو سوپایە. بۆیە بە گەورەییتان دەبێ بمبەخشن کە هەرگیزا و هەرگیز ناتوانم ئەو کارە قەبوڵ بکەم و بگەڕێمەوە ریزی سوپا. تەماشایەکی کردم و لە جێی خۆی راست بووەوە و نێوچەوانی ماچ کردم.

پاش کودەتای کەریم قاسم و گەراندنەوەی بارزانییەکان لە سۆڤێتەوە بۆ عێراق، ئێمە کە ژمارەیەک لە ئەفسەران بووین: من و سەعید عەزیز و میرحاج و نوری ئەحمەد تەها و ئەوانی دیکە بە پلەی رەئیس ئەوەڵ (رائد) گەڕاینەوە نێو سوپای عێراق و، من وەک فەرماندەی بەرگری میللی (مقاومة شعبية) نێردرامە رەواندوز.

لە بزوتنەوەکانی برادۆستدا، سەرکردایەتی ئەو جمووجوڵە بەبەندە

سپێردرا و، پاش ماوەیەک کرام بە سەرکردەی بەرگری میللی هەرێمی سەروو (منطقة الشمالية). شایانی باسە کە لە هەمان کاتدا رووداوە دڵتەزێنەکەی کەرکووک روویدا، کە ئەویش بە فاک و فیکی میری و کۆمۆنیستەکان بوو، تا ئۆباڵەکەی بخەنە سەر کورد و ئاگری دوژمنایەتی نێوان کورد و تورکمان کڵپە پێبدەن.

کاتێک کە بەرگری میللی نەمان، ئەوجا بووم بە یاریدەدەری فەرمانەدی حامییەی ئاکرێ، بەڵام لەوێ بە داوای خۆم گوێزرامەوە بۆ (تەجنیدی قەزای هاشمیە)ی سەر بە پارێزگای حلە. لەوێوە هەفتەی جارێک یان دوو جار دەچومە بەغدا و هەندێک کاروباری مەلا مستەفام بە ئەنجام دەگەیاند. کاتێک کە کەریم قاسم بەوەی زانی بۆ (فاو) نەفی کرام، بەڵام زۆربەی کات لە بارەگای تەجنیدی بەسرە دەمامەوە.

بێگومان گێرە و کێشەی نێوان عێراق و کوێت هەمیشە بەردەوام بوو. ئەو دەمەی کە من لە بەسرە بووم هێندەی نەمابوو رووداوێک لە لایەن (سریەی حراسە) لە بەسرە دژ بە کوێت بقەومێ و، لەو کەینو بەینەشدا گومانیان لە من دەکرد کە دەستم لەو کارەدا هەبێت بەڵام تەنیا پێوەندیم لەگەڵ چەند بەندکراوێکی کورددا هەبوو وەک: ئەحمەد حەمە ئەمین ئاغای دزیو، سەعیدی ئولوبەگی بارزانی و گرووپەکەی و چەند کەسانێکی دیکە و بەردەوام هاتوچۆی بەرێوەبەرایەتی بەندیخانەم دەکرد و، پێویستیەکانی ئەو بەندکرانەم ئەنجام دەدا. لە راستیدا سەرکردەی ئەو پیلانەی کە دژ بە کوێت کرا سێخەت (عەریف)ێکی کورد بوو. لەگەڵ ئەوەشدا من و فەرمانەدی مەوقیع کە عەمید مەجید عەلی بوو لەگەڵ ئەفسەرە کوردەکاندا کە هەمیشە لە نادی و شوێنی دیکە پێکەوە کاتمان بەسەر دەبرد و لە جێی خۆمان گوێزرایەنەوە، من بۆ بەغدا بۆ (معاونية امر مدرسة تموين ونقل). عەمید مەجید بۆ بەرێوەبەرایەتی تەجنیدی گشتی. ئەوانی دیکەش، هەندێکیان بۆ (مسیب)و جێی دیکە گوێزرانەوە.

سێ مانگێک بوو لە بەغدا مابوومەوە، ئەو دەمەش جموجوڵ لە نێوچەی

بارزان دەستی پێکرد بو، نیازمان هەبوو کارێکی یەکجار گەورە لە بەغدا بکەین، ئەویش تەقاندنەوەی فرۆکەخانەی بەغدا بوو، بە گشت فرۆکە و بۆمباکانییەوە. ئەو کارەش دوو سێخەت (عەریف)ی کورد پێی هەستان. بەڵام مەخابن ئەو قونبەلانەی کە دانرابوون، تەنها یەک فرۆکەی خراپ کردبوو. یەک لەو عەریفانەی کە بەو کارە هەستابوو، لە شەڕی سەفین لای من پێشمەرگە بوو و شەهید کرا. بەڵام ئەوی دیکەیان عەبدوڵا نوری عارف سەقا کۆیی و ئێستەش ماوە.

رۆژی ١٩٦٢/٧/١٢ لەگەڵ عەزیز عەقراوی و مولازم ئەتروشی چووین بۆ کۆیە و بێتواتە و لەوێشەوە بۆ رایات بۆ لای مەلا مستەفا. پاشان لەگەڵ مەلا مستەفا بەرەو رەواندوز بەرێکەوتین و لەوێشەوە چووینە نێوچەی خۆشناوەتی و لە گوندی هیران چەند رۆژێک ماینەوە و دوایی مەلا مستەفا گەڕایەوە بۆ نێوچەی رەواندوز و، منی کردە جێگر (وەکیل)ی خۆی لە نێوچەی خۆشناو و هەموو دەسەڵاتێکی سیاسی و سوپایی خۆی پێدام.

کاتێکی زۆری بەسەردا تێنەپەڕی بوو، هێرشمان بردە سەر چیای سەفین و لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا لە دەست داگیرکەرانمان رزگار کرد بە زیانێکی گەلێک کەم و، ژمارەی شەهیدەکانمان ٥ کەس بوو.

کە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دامەزرا، من یەکێک بووم لە ئەندامانی ئەنجوومەن، دوای کۆنگرەی پارتی لە کۆیە، ئیدی من لە کۆیە مامەوە و پاشان چوومە گەڵاڵە، لەوێ لەسەر فەرمانی مەلا مستەفا، من و سێ ئەفسەری دیکە: خدر دەباغ، نەوزاد خۆشناو، شەمسەدین لەگەڵ ٤ بارزانیدا یەک لەوان عومەر ئاغای دۆڵەمەری بوو چووین بۆ تاران. لەوێ مانگێک ماینەوە و دوایی چەند تۆپێکی (١٢٠میلمی)مان بۆ شۆڕش هێنا. لەوێشەوە چوومە ماوەت و ماوەی چەند مانگێک لەوێ وەک سەرپەرشتیکەری بزووتنەوەکان و سەرکردەی ئەکادیمیای جەنگ دەست بە کار بووم. کە ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی دەستی پێکرد،

من گـــەڕامـــەوە بۆ ڕانیـــە و لە ســـاڵی ١٩٦٧دا دانیـــشـــتم و وازم لە پێشمەرگایەتی هێنا، هەر لە هەمان ساڵدا من و چەند ئەفسەرێکی دیکە کە ئەوانیش ریزی پێشمەرگایەتیان جێهێشتبوو، جارێکی دی گەڕاینەوە ریزی سوپای عێراقی و من بە پلەی (مقدم) و پاشان بووم بە (عەقید).

ســـەردەمـــێک وەک بەڕێوەبەرێتی تەجنیـــدی دیالە و دەمـــێکیش هی کەرکووک کارم کرد، بۆ ماوەی (٨) مانگیش بە قایمقامی چەمچەماڵ، بەڵام هەر بە سیفەتی عەسکەری دانرابووم. پاش بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ خرامە سەر وەزارەتی نێوخۆ. وەزیری بەرگری ئەو دەمە حەماد شەهاب داوای لێکردم کە پلەی لیوا وەربگرم و ببمە سەرکردەی فیرقە (قائد فرقة). داوای بەخشینم کرد و ئیستیعفام کرد و، پاشی چوار مانگ قەبوڵیان کرد و خۆم قوتار کرد. ساڵی ١٩٧٢ بابەکر ئاغای پژدەری چەند جارێک (لەلایەن میرییەوە نێردرابوو) هاتە لام داوای لێدەکردم کە ببمە پارێزگاری سولەیمانی، بەڵام قەبوڵم نەکرد و داوای بەخشینم کرد.

لە یەکەم دامەزراندنی ئەنجومەنی تەشریعیدا، سەر لە نوێ بەڕێوەبەری ئاسایشی هەولێر و سەرکردەی ڕێکخراوی بەعسی (منعم بادی) هاتنە لام، منیـــان وەک ئەندامـــێکی ئەو ئەنجـــومـــەنە دانابوو، دیســـانەوە پاش تەقەلایەکی زۆر ئەو کارەشم قەبوڵ نەکرد و خۆم لێ رزگار کرد.

# کورتە باسێک

لە ساڵی ١٩٤٤دا کە فەرماندەی (بطرية)ی ٣ی سەر بە لیوای مەدفەعیە بووم لە کەرکووک زۆربەی زۆری ئەفسەرەکانیش لەوێ ئەو دەمە هەر کورد بوون، شەڕی دووەمی جیهانی کە لە گەرمەی دابوو، ئێمەی ئەفسەرانی کورد بە پێویستمان زانی کە ئەو دەرفەتە لە دەست نەدەین و بە تایبەتی بۆ کوردستانی ژێر دەستی عێراق هەوڵێکی وا بدەین کە مافی سەربەخۆیی بۆ کورد بەدەست بێنین و ئێمە وەک گشت گەلانی جیهان بە ئازادی شاد بین. لەم بارەوە بە باشمان زانی کە بیر و بۆچوونەکانمان لە چوارچێوەی بە یەکگەیشتن و چاوپێکەوتندا خۆ بنوێنێ، ئیدی لەو دەمەوە خەبات و تێکۆشانمان هەمیشە بە شێوەیەکی نهێنی بەردەوام بوو. لە هەمان کاتدا لە پێش و پاش شەڕی مایسی ١٩٤٢ (شەڕی رەشید عالی گەیلانی) بیرمان لەوەش کردەوە کە هێزێکی چەکدار رێک بخەین و رووبەڕووی دەسەڵاتی بەغدا بوەستینەوە، لەو کاتەدا گیر و گرفتێکم هاتە رێ و خێزانەکەم نەخۆش کەوت و لە عێراق چارەسەری نەدەکرا و ناچار بووم کە بۆ سێ مانگ مۆڵەت وەربگرم و بیبەم بۆ لوبنان، لەو کاتەدا مەلا مستەفا لە نێوچەی بارزان دژی رژێمی عێراق لە شەڕدا بوو.

ماجید بەگ مستەفا کە ئەو دەمە وەزیری دەوڵەتی عێراق بوو، هاتبوە کەرکووک و لەماڵی موقەدەم ئەمین رەواندوزی لەگەڵ ئێمەدا کۆبوونەوەیەکی کرد و هەر لەوێش مامۆستا رەفیق حیلمی (سەرۆکی کۆمەڵەی هیوا) ئامادە بوو، مەبەستی نێوبراو (ماجید بەگ مستەفا) ئەوەبوو کە بچێتە لای مەلا مستەفا و قەناعەتی پێ بکات کە لەگەڵ رژێمی بەغدا پێک بێت. لە ئەنجامدا چەند پێشنیازێکمان کرد و ئەو پەیمانەی کە دەسەڵاتدارانی بەغدا بە ماجید بەگ مستەفایان دابوو (خودموختاری بۆ کورد) بە گەرمی داوا و پشتگیریمان لێ کرد کە زوو بکرێت لە جێ بەجێ کردنیدا.

له ئەنجامدا بەهادین نوری بەگ بە پارێزگاری (محافظ) سولەیمانی و بڕیاریش وا بوو کە ئەمین ڕەواندوزی ببێتە (قایمقامی) ڕەواندوز و مستەفا خۆشناو، مەجید عەلی و من و چەند ئەفسەرێکی دیکە ببینە لێپرسراوی (مدیر ناحیة) بەڵام لە گەڕانەوەی مەجید بەگدا، من تا هەولێر لەگەڵی ڕۆیشتم و پاشان چوومە بەغدا و لەوێشەوە لەگەڵ نەخۆشەکەمدا بەرەو لوبنان کەوتمە ڕێ.

شایانی باسە، کە ئەو شانۆگەریەی کە بە نێوی (ئۆتۆنۆمی)یەوە ئامادەکرا بوو بدرێتە کورد، پیلانێکی سەر بە حکومەتی بەریتانیا بوو، چونکە تورکیا ڕێگەی بە هێزەکانی نەدەدا بچنە ناو سوێندخۆرەکانەوە (حلفا)و گومانی لەوە هەبوو، نەوەک لەگەڵ (دووەلی محوەر) ڕێک بکەوێت، پاش ئەوەی کە تورکیا کوردی وەک گورگ و دڕندە نیشان دا، ئەوجا ڕێگەی بە هێزەکانی دا کە بچنە نێو سوێند خۆرەکانەوە. بەم چەشنە پەردەی شانۆگەری (ئۆتۆنۆمی) کوردیش داخرایەوە.

پاش سێ مانگ مانەوەم لە لوبنان گەڕامەوە عێراق و لە کەرکوک هەوڵێکی زۆرم دا کە خانەنشین بکرێم، بەڵام بێ سوود بوو. ناچار هەڵاتم و چوومە کۆیە و لەوێشەوە روم لە دەشتی کۆیە (گوندی شیواشان) ناو لەو گوندە کە موڵکی خۆم بوو مامەوە.

حکومەتی عێراق لە ڕێگەی خەزوورمەوە (سەبری عەبدوڵلا) کە بەڕێوەبەری پۆلیسی سولەیمانی بوو گەلێک هەوڵی دا بگەڕێمەوە و، وەک ئەندامێکی پەرلەمان وەزیفەم بدرێتێ، بەڵام هەوڵدانەکانیان بێ سوود بوو.

لەم بارو دۆخە ئاڵۆز و گیروگرفتاویەدا خێزانەکەم کە بە نەخۆشی لە لوبنان جێهێشتبوو کۆچی دوایی کرد. سەبری بەگ چووە لوبنان و تەرمەکەی هێنایەوە عێراق و لە حەزرەتی گەیلانی بە خاک سپێردرا. پاشان بە نهێنی چوومە ماڵی خەزروم لە سلێمانی و لەوێ هەموو ڕۆژێک ئەفسەرە کوردەکان سەردانیان دەکردم، ڕۆژێکیان موقەدەم ئەمین ڕەواندوزی

ئاگاداری کردم کە کۆمەڵەی هیوا، مستەفا خۆشناو و میرحاج حاجی ئەحمەدی ناردووتە لای کۆمەڵەی "ژێ کاف" لەمەهاباد، بەڵام لە گەڕانەوەیاندا میرحاج گیراوە و مستەفا خۆشناو هەڵاتووە. پاشان منیش لە سولەیمانی گەڕامەوە شیواشان و پاشان ماوەیەک نامەیەکم لەمستەفا خۆشناوەوە بە دەست گەیشت، نووسیبووی:

"کاکە ئێستە من لە گوندی (ئەنگۆز)م نێزیک بە گوندی بێتواتە و خەریکی پەیدا کردنی چەکێکم و ئەوسا دێمەوە لای تۆ".

بەڵام دیار بوو کە لە بارزان پێویستیان پێی بوو بۆیە بەرەو ئەوێ ڕۆیشتبوو. پاش ماوەیەکی دی نامەیەکم لە کاک عیزەت عەبدولعەزیزەوە بە دەست گەیشت، داوای کردبوو کە لە گوندی بیستانەی نێزیک هەولێر یەکدی ببینین، بەڵام نامەکەم ڕۆژێک درەنگتر بە دەست گەیشت وەک لە پێویست، ئەویش هەڵەی تەتەرەکە بوو کە ڕێی ون کردبوو، هەر ئەو شەوە دەستوبرد لە شیواشانەوە بەرەو بیستانە کەوتمە ڕێ. بەر لەوەی بگەمە جێ زانیم کە کاک عیزەت چەند چەکدارێکی عەلی ئاغای مەحموودی کاکە خانی دزەیی لەگەڵدا بووە و لە ڕێگەی دەربەندی گۆمەسپانەوە بەرەو شەقلاوە، و لەوێشەوە بەرەو بارزان کەوتووەتە ڕێ. کاتێک کە شەڕ، لە بارزان دەستی پێکرد، کاک عیزەت لەوێوە نامەیەکی بۆ ناردم و داوای کردبوو کە بچمە لای بابەکراغای سەلیم ئاغا و عەباسی مەحموود ئاغا لە پشدەر و داوای کۆمەک و پاڵپشتیان لێ بکەم بۆ شەڕی بارزان. بە خۆم و شەش چەکدارەوە چوومە شاری مەرگە و لەوێشەوە چوومە لای باپیری مەحموود ئاغا لە گوندی (نورەدین)، شایانی باسە کە باپیراغا مرۆڤێکی ژیر و لێهاتوو بوو و سەرۆکی کۆمیتەی پژدەر بوو. لەوێشەوە چوومە گوندەکەی عەباس ئاغا (چۆم خرکە)و پێنج ڕۆژێک لای مامەوە و هەوڵێکی زۆرم دا ئەو مەبەستەی بۆی چووم بە دەستی بێنم، بەڵام مەخابن ئەنجامێکی باشم بە دەست نەهێنا و هۆیەکەشی ئەوە بوو کە لەگەڵ بابەکراغادا ناکۆک بوون و لە دەرفەتێکیش دەگەڕا کە لە ڕێی حکوومەتی

عێراقەوە تووشی تەنگ و چەڵەمەی بکات.

لە کاتی گەڕانەوەمدا بۆ دەوروبەری کۆیە، شەو بە سەردا هات و دەستەیەک پۆلیس لە شیواشانەوە ڕێی پێ گرتین. لە ئەنجامی بەیەکدادانی هەردوولاماندا بریندارکرام و هەر بەو وەزعە لە چیاکانی ئەو نێوچەیە مامەوە. لە هەمان کاتدا دەسەڵاتدارانی ڕژێم ماڵیان تێکرا بە تاڵان بردم و لە کۆیە هەڕاجیان کرد و فرۆشتیان.

پاش دوو حەفتەیەک کە هەستم بە باشی کرد و دەمتوانی هەنگاو بنێم و لەگەڵ چەکدارێکمدا ڕێی بیتوێنم گرت و شەو لە گردی (قاجە) لە نێزیک گوندی (قەسرۆک) لە ماڵی سەردارێک بە نێوی (ڕەسوولی گوڵێ) لامدا و بوومە میوان. ناوبراو هاتوچۆی ئێرانی دەکرد و شتوومەکی قاچاغی ئاڵوگۆڕ دەکرد. پاشان من و خزمێکی خۆم (عەبدئاغا)و ئەوانی دیکە کە ژمارەمان ببوە (١٣) چەکدار بەرەو گوندی وەرتێ - ناوچەی خۆشناوەتی - بەڕێ کەوتین و شەوێکیش لەوێ ماینەوە، پاشان لە ڕێی حاجی ئۆمەرانەوە بەرەو گوندی (زەرگەتەن) چووین، ئەم گوندە کەوتووەتە ناوچەی خانێ، لە دەشتی لاجانی ئێران.

# مەهاباد

لە گوندی زەرگەتەنە بەرەو مەهابادی رەنگین و دلّڕفێن بەرێ کەوتین. بەفرێکی زۆر، شەقام و کۆڵانەکانی مەهابادی داپۆشیبوو، لەماڵی میرزا غەفووری رەسوڵی بوومە میوان. ناوبراو ماوەی ٢٠ ساڵێک لە کۆیە ژیا بوو، ناسیاوییەکی باشمان لەگەڵ یەکدی هەبوو گەلێک میوان پەروەر و بە خزمەت بوو، زۆریشی هەوڵ دا کە هەر لەوێ بمێنینەوە بەڵام پاش تێپەڕ بوونی حەفتەیەک لەگەڵ برادەرێکی دیکەدا (مامۆستا مەحموود شەنگە) پێکەوە چووینە میوانخانەی (فەیروز)و لەوێ نیشتەجێ بووین. هەر لەو سەردەمەدا بەڕێز شێخ ئەحمەدی بارزانی خۆی و ٦٠ بارزانی لەمەهاباد دا دەژیان. بە دەرفەتم زانی سەردانێکی شێخم کرد و خۆم پێناساند، ئەویش گەلێک رێزی لێ دەگرتم. ئیدی وای لێهات زۆربەی کاتم لای شێخ بەسەر دەبرد. کات بەرەو وەرزی بەهار دەچوو. کە هەتاو و هەوا خۆش دەبوون لەگەڵ شێخ دەچووینە دەرەوەی شارو نیشانی تفەنگمان دەنایەوە. ئەو دەمە نەزیری کوڕی و لوقمانی مەلا مستەفا لە تەمەنی ١٢ – ١٤ ساڵیدا بوون، فێری نیشانی تفەنگ و دەمانچەیان دەکردن، تا وایان لێهاتبوو ببوونە نیشانچییەکی زۆر باش. ماوەیەک بەو چەشنە ژیانم بەسەر دەبرد. لەمەهابادیشدا لەگەڵ چەند کەسانێکی شارەزادا ناسیاویم پەیدا کردبوو، وەک: سەدیق حەیدەری، عەلی خوسرەوی، لە تیف مازووچی و ژمارەیەکی تردا.

بەر لە هەڵکردنی ئالای سێ رەنگی کوردستان لە شاری مەهاباد بە چەند رۆژێک دێهات نشین و عەشیرەتەکان گەورە و بچووک، ژن و پیاو و منداڵ، پۆل پۆل بەرەو مەهاباد دەهاتن. شار بەرگی خۆشی و شادی پۆشیبوو، سەرتاسەری مەهاباد رازابۆوە.

رۆژی ٢٦ کانونی دووەمی ١٩٤٦بوو، دانیشتوانی مەهاباد و دەور و پشتەکەی رژابوونە مەیدانی چوارچرا. جوانیی رەنگی جل و بەرگیان و

بەزم و شایی و خەندەی سەر لێوانیان ئازادی و سەربەخۆیی تێدا دەبینرا. بە پەرۆشەوە چاوەڕێی هاتنی پێشەوای بەڕێز قازی محەمەدیان دەکرد. کاتێک پێشەوا پەیدا بوو بە چەپڵە ڕێزان و هوتافات پێشوازی لێ کرا. دروشمی "نەمری بۆ پێشەوا و کورد و کوردستان" لە هەموو لایەک دەنگی دەدایەوە، ئالآی سێ ڕەنگی کوردستان بەرز کرایەوە، تەقەی تفەنگ و هەلهەلە و جۆش و خرۆشی خەڵکەکە گەیشتبووە ئاسمان.

پێشەوا قازی محەمەد بە گەلێک حورمەت و ڕێزەوە لە بن ئالآی کوردستاندا، رووی لە جەماوەری تینووی ئازادی مەیدانی چوارچرا کرد و دوای پێشکەش کردنی سڵاوی گەرم، فەرمووی:

"ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژە لە ژیانی هەموو کوردێک دا کە ئالآی سەربەخۆیی کوردستان هەڵکراوە و لەبەرزایی مەهاباد دا دەشەکێتەوە. گەلی کورد وەک گشت گەلانی جیهان مافی تایبەتی و سەربەخۆیی هەیە. سەدان ساڵە بۆ ئەم ئامانجە پیرۆزە خەبات دەکات، هەزاران قوربانی لەو ڕێگەیەدا پێشکەش کردووە، هەر لە گەورە پیاوان و لاوانی کورد و گوڵاڵە سوورەی بەهارانی کوردستان بە خوێنی ئەم شەهیدانە ئاو دراون. گۆڕستانی شەهیدانی ڕێگەی ڕزگاری بەشێکی زۆری زەوی لە هەر چوار بەشی کوردستاندا داپۆشیوە و تەرمی پیرۆزیان کەوتە ژێر خاک و بە ئاوات نەگەیشتن.

ئەوڕۆکە، گەلی کورد لە ئێراندا بەختەوەرترین کوردن لە کوردستانی مەزندا، کە ئەمەش ئەنجامی ڕەنج و فیداکاری ئەو شەهیدە قارەمانانە بوو. شاری مەهاباد ئەو شەوقە گرنگ و پیرۆزەی لە یەکەم خەباتی ئەم چەرخەدا بە دەست هێنا کە دەبینین ئالآی سێ ڕەنگی کوردستان لەبەرزایی مەهاباددا دەشەکێتەوە.

ئێمە ئێستە سەربەخۆین و دۆستی گەلێک بە هێزیشمان هەیە، هەڵکردنی ئالآی کوردستان بە ئاسانی لەمەهاباد دا فیداکارییەکی زۆری دەوێ تا بپارێزرێ، ئەو ئەرکە پیرۆزەش کەوتوتە سەرشانی ئێوە و ئەو

چرایە نابێت بکوژێتەوە، رۆحی پاکی شەهیدانی کورد، وا بەسەر سەرتاندا دەسووڕێتەوە، هەر سستی و کەمتەرخەمییەک لە گیان فیدا کردن، ئەوانە محاسەبەمان دەکەن. یەکەم بە پشتیوانی خوا و دووەم بە هیمەتی بەچکە شێرانی کورد ئەو مافە دەپارێزرێت".

لە کاتی هەڵکردنی ئاڵای کوردستاندا، برادەرێکی دڵسۆزی دانیشتووی سولەیمانی (کاک عوسمان دانش) هێندە تەماشای ئاڵاکەی کرد فرمێسک لە چاوانی دەباری و لە هۆش خۆی چوو، کەوتە سەر زەوی، هەروەها (نەقیب سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی نەهری) ووتارێکی جوانی پێشکەش کرد. مامۆستا هێمنی تازە لاویش هەڵبەستێکی خوێندەوە و تێیدا ووتبووی: "ئۆخەی نەمردم و گەیشتمە ئاوات..".

ئەو رۆژە تا شەوێکی درەنگ جەماوەری مەهاباد بە گۆرانی و بەزم و شایی کاتیان بردە سەر. من و کاک مەحموودیش گەڕاینەوە میوانخانەکەمان و لە هۆڵەکە دانیشتین. لەو کاتەدا ئەفسەرێکی تەمەن بیست ساڵە (پلەی ژەنراڵی لەسەر شان بوو) شمشێرێکی بە قەدەوە بوو هاتە میوانخانەکە. دیار بوو لە خۆیەوە ئەو بەرگەی پۆشیبوو، خۆ ئەگەر نا ئەو تەمەنە هی ئەوە نەبوو کە بگاتە پلەی ژەنراڵی.

زۆری پێ نەچوو هاتە لای مێزەکەی ئێمە و لەگەڵمان دانیشت و خۆی پێ ناساندین (محەمەد ئیسحاقی ناو بوو)و دەستی کردە ووتوێژ لەگەڵماندا ئێمەش سەبارەت بەو رۆژە پیرۆزە و ئەو رووداوە گرنگەی ژیانی نەتەوەکەمان و هەر چییەکیشمان بە باش زانی بۆمان باس کرد. هەر پاش ئەوە هەستا و جێی هێشتین و رۆیشت. پاش تێپەڕ بوونی کاتژمێرێک چەند چەکدارێک هاتن و ئاگاداریان کردین کە کاک محەمەد ئیسحاقی لە دەگەی پۆلیس چاوەڕێمان دەکات. پێ دەچوو کە کاک محەمەد زابتی پۆلیسە، روسەکانەوەیە و فەرمان لەوانەوە دەردەچێ و کۆماری مەهاباد تاوانی نی‌یە. ئەوجا ئایا دەتوانین لەگەڵ روسەکاندا بەشەڕ بێین؟ پاش ئەوەی کە شێخ کەمێک هێور بووەوە، بڕیاری دا کە

مەهاباد بەجێ بێڵێن و رووی تێکردم و فەرمووی: تۆ بەرەو کوێ دەچیت؟ پێم ووت کە دەچمە لای مەلا مستەفا لە شنۆ. فەرمووی هەر چەندە ئاگاداری‌یەکی تەواومان لەم هەڵوێستە نی‌یە، بەڵام ئێمەش بەرەو ورمێ دەچین. ئەوان روویان لە گوندی شەیتان ئاوا کرد و ئێمەش لەگەڵ شێخ محەمەد سدیق و خێزانەکەی و چەند بارزانییەکدا بەرەو نەغەدە کەوتینە رێ و لەوێوە بۆ شنۆ. کاک مەحموود شەنگەش بەرەو سولەیمانی گەڕایەوە.

گەیشتینە شنۆ، لەوێ مەلا مستەفا لەگەڵ هەندێک ماڵە بارزانی و برادەراندا نەقیب مستەفا خۆشناو، نەقیب میر حاج، مولازم جەلال ئەمین، مولازم خێروڵڵا عەبدولکەریم، مولازم نوری ئەحمەد تەها، مولازم محەمەد قودسی، مولازم عەبدولرەحمان نەقیب، مولازم مەحموود ساڵەح، کاک هەمزە عەبدوڵڵا، وەهاب ئاغای حەمە عەلیاغای جوندیان و سەعید ئاغای برای، دانیشتوون. یەک سریەش سەربازی رووس لە ژێر فەرماندەی نەقیب مەمەدۆڤ دا لە شنۆ بوو.

دوای چەند رۆژێک مەلا مستەفا، کاک هەمزە عەبدوڵڵا و مستەفا خۆشناو و میرحاجی نارده لای ژەنراڵ ئەتاکشیۆڤ (سەرکردەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران) بۆ چارەسەرکردنی ئەو زرووفە نالەبارەی کە تێیدا بووین. بەڵام رووسەکان بۆ دڵنەوایی راگرتنی ئەمریکا و ئینگلیز لە ئێران مەلا مستەفایان لەو ناوچەیەی سەربەخۆیان دانابوو (بە نهێنی لە شنۆ دابنیشێ و کەس نەیبینێ). ئەمە هەمان سیاسەتی رووسەکان بوو بەرامبەر بە شێخ ئەحمەدی بارزانی کە لەمەهابادیان بەدەر نا.

پاش ئەوەی کە نێو براوان بەو کارەی مەلا مستەفا چوون بۆ لای ئەتاکشیۆڤ، ئیدی من لە جێیەکەی ئەوان مامەوە، و مانگێ (١٠) تومەنێکم دەدایە کرێی ژوورەکە.

## چۆن کاتمان لە شنۆ بەسەر دەبرد

مەلا مستەفا بە ڕۆژ لە ماڵەوە نەدەچووە دەرێ، ئیدی وا ڕێک دەکەوت زۆربەی شەو دەهاتنە لای من و پێکەوە کاتمان بەسەر دەبرد.

یەک لەو شەوانە مەلا مستەفا و ٤ چەکداری و چەند برادەرێکی دیکەمان: کاک خێروڵڵا و کاک جەلال ئەمین و وەهاب ئاغا و کاک محەمەد ساڵح لای من کۆبووینەوە، و تا نێزیکی بەرەبەیانی بە قسەی خۆش و گۆرانی و وتوێژکردن بردمانە سەر. کاک جەلال ئەمین دەنگی لە هەمووومان خۆشتر بوو، جا هەموو فێڵمان لێ دەکرد، کە نۆرەی گۆرانی ووتنی ئەو دەهات تێکڕا دەمانکردە هەراو گەرەلاوژە و هەریەک لای خۆیەوە گۆرانی دەووت. مەلا مستەفاش دەنگی ناخۆش بوو، کە نۆرەی ئەو دەهات، پێم دەگوت توخودا تۆ گۆرانی مەڵێ چونکە دەنگت زۆر ناخۆشە، کە نۆرەش دەگەیشتە سەر من ئەویش هەر وای پێ دەگوتم. هەمیشەش وا دادەنیشتین کە کاک جەلالی دەنگ خۆش بکەوێتە لای چەپی من، کاک وەهابیش گەلێک نوکتەی خۆشی لەسەر باوکی لێمان کردبووە هۆنەر (شاعیر) و پێمان دەگوت یەک لە هۆنراوەکانت بڵێ، بۆ وێنە دەیگوت:

"لە کۆڵانانا رادەبوورم جوانێک لە حەوشە پیازی وورد دەکرد". ئێمەش تێر پێدەکەنین و بەو چەشنە گەلێک بە خۆشی شەوانمان بەسەر دەبرد. بێگومان ئەو سەردەمە هەر فانۆس هەبوو کە بە کارمان دەهێنا. پاش ئەوە چەند کاتژمێرێک دەنوستین، بۆ نیوەڕۆش دەچووینە ماڵی مەلا مستەفا کە لە خانووی کەریم ئاغای تەلیوان دەژیا. ئەو خانووە دوو نهۆم بوو، لەسەرەوە منداڵەکانی لێ دەژیا، لە خواریشەوە ژوورێک، کرابوو بە دوو بەشەوە، بەشێکیان چەکدارەکانی تێدا بوو، ئەو بەشەی دیکەش کە هیچ پەنجەرەی تێدا نەبوو کردبوومان بە دیواخان، جا لەبەر تاریکی ناچار بووین کە بە ڕۆژیش فانۆس دابگیرسێنین، نان خواردنیشمان هەر لەم ژوورە بوو.

گەلێک جاریش خۆمان بە فێرکردنی زمانەوە خەریک دەکرد، مەلا

مستەفا فارسی دەزانی و فێری دەکردین، ئێمەش ئینگلیزیمان بەو دەگوتەوە. لە هەمان کاتدا هەوڵی ئەوەشمان دەدا کە کەمێک رووسی فێر ببین، ماوەیەک بەو جۆرە رامان بوارد چاومان هەر لە گەڕانەوەی کاک هەمزە و برادەران بوو.

## بەسەرهاتی زێڕ فرۆشتن

مانگێک تێپەڕبوو بەسەر ڕۆیشتنەکەی کاک هەمزە عەبدوڵڵا و برادەران، بەڵام هیچ هەواڵێکی گەڕانەوەیان نەبوو. ڕۆژێک مەلا مستەفا بە شوێنیدا ناردم و چوومە لای و پێی ووتم: دەزانی هیچ کەسێک یارمەتیمان نادات و مەسرەفێکی زۆری بارزانی‌یەکانیشم بە سەرەوەیە و هیچ پارەیەکم بە دەستەوە نەماوە. پرێسکەیەکی دامێ کە هەندێک زێڕی تیا بوو، پێی ووتم کە ئەوە هی دایکی مەسعودە و بەڵکو لە جێیەک بیفرۆشم و بە پارەکەی ماوەیەک گوزەران بکەین تا خودێ زرووفێکی لە بارمان بۆ دێنێتە بەردەست. مەبلەغی ٢٥ دیناریشی بۆ خەرجی ڕێگە پێدام.

لەسەر بڕیاری مەلا مستەفا، وەهابی حەمە عەلیاغا و سەعیدی برایم لەگەڵ خۆم بۆ پارێزگاری ڕێگە برد و دوو تفەنگی برنەویشم هەبوو، ئەوانیشم هەر لەگەڵ خۆم برد و چووین بۆ نەغەدە. لە ڕاستیدا دەمویست کە ئەو دوو تفەنگە بۆ خەرجی ڕێگە بفرۆشم.

لە نەغەدە تووشی کاک هەمزە و برادەران هاتین کە ئەوانیش هەر ئەو ڕۆژە گەیشتبوونە ئەوێ، هەواڵی ڕۆیشتنەکەیانم پرسی، بەڵام لە وەڵامدا ووتیان کە هیچ ئەنجامێکیان بە دەست نەهێناوە و سەبارەت بە زێڕەکانیش، لە نەغەدە نرخێکی کەمیان پێ دەدا، مسقاڵی (٢٠) تومەن، منیش نەم فرۆشتن، هەر لەوێ تفەنگێکم بە کاک هەمزە بە (٥٠) دینار فرۆشت، ئەویش تفەنگەکەی دا بە ئەحمەد کاروانچی (لە عێراقەوە هاتبوو خەڵکی ڕەواندوز بوو) کە لەگەڵ خۆی بۆ عێراقی بەرێتەوەو لەوێ بیفرۆشێتەوە، چونکە ئەو دەمە لە عێراقدا نرخی زۆر بوو. کاک وەهابیش مەبلەغی (٣٠) دیناری لە کاک ئەحمەد وەرگرت و نامەیەکیشی دایە کە لە ڕەواندوز لە حەمە عەلیاغای باوکی وەربگرێتەوە. هەروەها ئەوەشی پێ ووتبوو کە لە گەڕانەوەیدا سەر لە نوێ بۆ ئێران، دەبێ مەبلەغێک پارەی

دیکەش لە باوکی وەربگرێ و بۆی بێنیتەوە.

بەفرێکی هێندە زۆر باریبوو کە رێگەی هاتوچۆی گرتبوو، ماشێنیشمان (ئۆتۆمۆبیل) دەست نەدەکەوت کە بچینە ورمێ، ناچار دوو رۆژ لە نەغەدە ماینەوە. رێکەوت کاروانێک سەربازی رووسی بە ماشێن بەرەو ورمێ دەچوو، ئێمەش بە دەرفەتمان زانی و خۆمان هاویشتە یەک لەماشێنەکان و پێمان وابوو کە رووسەکان رەنگ بێ زۆر مەرد بن و کرێی رێگامان لێ نەستێنن، بەڵام هێشتا هەر بەرێوە بووین کە داوای کرێکەیان لێ کردین و (١٢٠) تمەنیان لێ سەندین کە دەیکردە (١٢) دیناری عێراقی. گەیشتینە ورمێ و لەوێ لە ئوتێلی (لادەن) لامانداب، ئەو کاتە کاک عێزەتیش هەر لەم ئوتێلە بوو. ماڵی سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی لە ورمێ بوو. لێرەش هەوڵێکی زۆرمان دا بۆ فرۆشتنی زێڕەکان، بەڵام جوولەکە زێڕینگرەکان بۆ هەر مسقاڵێک (٢٠-٢١) تمەن زێتریان پێ نەدەدا، ئێمەش بە چاکمان نەزانی بیانفرۆشین. پێیان ووتین کە لە تەورێز پارەی باش دەکات، ناچار لە ورمێ وە بە کەشتی بەرێ کەوتین بۆ شاری شەرەفخانە (شارێک بوو لەوبەری دەریاچەکەو شەمەندەفەری تەورێز تا ئەم شارە دەهات) کەشتیەکە پڕ بوو لە ئەفسەر و سەربازی رووس ئەوانیش هەر بەرەو تەورێز دەچوون. لە شەرەفخانە (٦) کاتژمێر چاوەڕوانمان کرد تا شەمەندەفەرەکە گەیشت، ئەو ماوەیەمان لەوێ بە تاوڵە کردن لەگەڵ دوو ئەفسەری سۆڤێتیدا بەسەر برد، ئەفسەرەکان قەفقاسی بوون و تورکییان دەزانی. سواری شەمەندەفەر بووین بۆ تەورێز، لەوێ لە ئوتێلی (شەبوستەری) لاماندا. شەو لەبەر چڵکنی و کێچ و ئەسپێی نێو جلەکان خەومان لێ نەدەکەوت. بۆ بەیانی هەریەکەمان سەرو فانیلە و کراسی کڕی، ئەوانەی خۆشمان هێندە چڵکن و ئەسپێیاوی بوو کەڵکی ئەوەی نەمابوو کە بشۆردرێت و لەبەر بکرێتەوە، ناچار لە نێو زۆپای ئوتێلەکەمان ناو سووتاندمان. هەر ئەو رۆژەش ئوتێلەکەمان گۆڕی بە یەکی دیکە کە نێوی (میهمانخانەی نەو) بوو. گەلێک مەهابادی و کوردی دیکە لەم ئوتێلە دابەزیبوون.

شەو دەنگی گۆرانی کوردی و تورکی لە یەکێک لە ژوورەکان دەهات، دەنگ و ئاوازێکی گەلێک خۆش بوو، لە نزیکی ئەو ژوورە راوەستاین و گوێمان دەگرت، یەکێک هاتە دەرێ و ئێمەی چاو پێکەوت، پێی ووتین کە بۆ لەوێ راوەستاوین و فەرمووی چوونە ژوورەوەی لێکردین. برادەرەکە خەڵکی مەهاباد بوو، پێی ووتین کە ئەوانی دیکەش خەڵکی ئەوێ و سەقزن. کە چووینە ژوورێ دیتمان یەک لەو ئەفسەرە سۆڤێتیانەی کە لە شەرەفخانە تاوڵەمان لەگەڵدا دەکرد (پلەی کەپیتانی هەبوو) لەوێ دانیشتووە و بە گەرمی هەواڵی پرسین. ماوەیەک گوێمان لە گۆرانی گرت و پاشان لەگەڵ کەپیتاندا ماوەیەک بەپرسیار و وەڵام بردمانە سەر. لە قسەکانیدا پێ دەچوو کە زۆر لەگەڵ راو هەڵوێستی ستالین و سیستمی کۆمۆنیزمدا نەبێت.

دوای چەند رۆژێک مانەوەمان لە تەورێز توانیم زێڕەکان مسقاڵی بە ٣٠ تومەن بفرۆشم. بەر لە گەڕانەوەمان بۆ مەهاباد دیتم کە چۆن سوپای رووسی هەر لە کاتژمێری (٨)ی بەیانییەوە تا کاتژمێری (٤)ی پاش نیوەڕۆ لە تەورێزەوە بەرەو سۆڤیەت دەگەڕانەوە. ئەم چوونە دەرەوەیان پەیوەندی بەو رێککەوتننامەیەوە هەبوو کە لە تاران لە نێوان سۆڤیەت و بەریتانیا و ئەمریکادا لە ١٩٤٣دا کرا. بەو پێیە دەبوو (٦) مانگ پاش کۆتایی هێنانی شەڕ، هەموو سوپای بێگانە لە خاکی ئێران بچێتە دەرێ. هەر لەوێدا لەسەر ئەوەش پێکهاتبوون کە سنووری ئێران بپارێزرێ و دەسەڵاتی نێوەندیش وەک خۆی بمێنێتەوە. بە پێی ئەو پەیمان نامەیە، رووسەکان لە ئێران کشانەوە، ئەمریکا و بەریتانیاش بۆ پاراستنی بەرژەوەندی نەوتی ئێران لەگەڵ شادا، وا رێککەوتن کە شارەزایان و پسپۆرەکانیان لە کۆمپانیاکانی نەوتی ئێراندا بمێننەوە. بەڵام لە راستیدا ژمارەیەکی کەمیان نەبێت کە ئێرانیان جێ هێشت، خۆ ئەگەرنا ئەوانی دیکەیان هەر لەوێ مانەوە.

ئیدی ئێمەش هیچ کارێکمان لە تەورێز نەما و لەگەڵ چەند

مەهابادییەکدا بە ماشێن بەرەو مەهاباد کەوتینەڕێ. سەرمایەکی بێ ووزە و شەوێکی گەلێک سارد بوو گەیشتینە میاندواو و لەمیوانخانەیەک لاماندا و بڕیارماندا کە بۆ سبەینێ بکەوینە ڕێ. هێشتا ماندوویەتیمان نەحەسابۆوە، دوو چەکدار پەیدا بوون، روویان لەمن و کاک وەهاب و سەعیدی برای کردو ئاگاداریان کردین کە دەبێ میاندواو بەجێ بێڵین، ئەمەش بە فەرمانی تۆماس عەلییێڤ بوو، کە ئەفسەرێکی رووسی لێپرسراوی بازێڕی میاندواو بوو. گەلێک هەوڵمان لەگەڵ دان کە بمێنینەوە بەڵام بێ سوود بوو، ناچار لەگەڵ ئێمەدا مەهابادییەکانیش بەو شەوە سەرماو سۆڵەیە میاندواویان بەجێهێشت. کە گەیشتینە مەهاباد، چەند رۆژێک بوو مەلا مستەفا لە لایەن بەڕێز پێشەواوە بانگ کرابووە ئەوێ و وەک پاشایەک پێشوازی لێ کرابوو، محەمەد قودسی و عەبدولڕەمان تەیبیشیان لەگەڵ بوو. لەمەهاباد لەگەڵ مەلا مستەفا چووینە خزمەت پێشەوا و لەوێ مەسەلەی دەرکردنمانم لە لایەن "عەلییێڤ"ەوە بۆ گێڕانەوە. پێشەوا گەلێک بەو هەڵوێستە نیگەران بوو، فەرمووی: ئەوە کابرایەکی گەلێک خراپە و کەس لێی رازی نییە و وا دەکەم کە لەوێ نەمێنێ. رۆژی دواتر ئەو ئەسپەی کە بەڕێز مەلا مستەفا لە شنۆوە پێی هاتبووە مەهاباد و مەبلەغی (١٧٠٠) تومەن بوو، پێی دام. پارەی زێڕەکان کە بۆم هێنابۆوە (٣٩٠٠) تومەن بوو. ئەوەی کە مابۆوە بۆ ماڵەکەی ناردەوە.

## دروستبوونی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق

پاش شۆڕشی بارزان و دامەزراندنی کۆماری مەهاباد و گۆڕانی زرووفی سیاسی لە دونیادا و بە تایبەتی لە ئێراندا، مەلا مستەفا بیری کردەوە کە جەماوەری کورد لە کوردستانی عێراقدا پێویستی بە پارتێکی سەربەخۆ هەیە. لەبەر ئەوە لەمانگی ١٩٤٦/٢ پارتی دیموکراتی کورد لە عێراقدا بە هاوکاری ئەم ئەفسەر و ئەهلییە تێکۆشەرانی خوارەوە دروست بوو:

مەلا مستەفا، هەمزە عبدالله، ئەنوەر دڵسۆز، بەکر عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، نوری ئەحمەد تەها، محەمەد قودسی، عێززەت عەبدولعەزیز، خێروڵڵا عەبدولکەریم، جەلال ئەمین، محەمەد ساڵح ژاژەڵە، عەبدولڕەحمان نەقیب، میرحاج ئەحمەد، وەهاب محەمەد ئاغا و شێخ لە تیف شێخ مەحمود حەفید. بێگومان ئەم پارتە لەسەر شێوەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە مەهاباد دروست بوو.

ڕۆژێک مەشقم بە بارزانییەکان دەکرد لە دەشتایی سەربازخانەکە، کات دوای نیوەڕۆ بوو، لە ناکاو پێشەوا و حەمە حوسێن خان، نانەوازادە و موقەددەم روکن کازمۆڤ (موقەددەم روکنێکی رووسی بوو ناومان نابوو کاکەئاغا) پەیدا بوون، منیش چوومە پێشوازیان و بەخێرهاتنم کردن کەمێک وەستان و تەماشای مەشقەکەیان کرد. دیار بوو بەو مەشقە گەلێک خۆشحاڵ بوون و پێشەوا رووی تێکردم و فەرمووی: ئێوە چەند ئەفسەر دەبن لەگەڵ مەلا مستەفا؟ پێم ووت (١١) ئەفسەرین. پرسی چەند جۆر پۆلمان هەیە؟ وەڵامم دایەوە کە هەندێکمان تۆپچی (مەدفەعی)ین و هەندێک پیادە و سوارە و دروع و هەندەسە و (تەموین و ئیعاشە)ین. واتە هەمو جۆرە پۆلێکمان هەیە.

پاشان فەرمانی بە نانەوازادە دا کە بە گوێرەی پلەو پۆلەکانمان لیستەیەکی نێوەکانمان بنوسێت. لیستەی نێوەکان بەم چەشنەی خوارەوە، نوسرا:

١- رەئیس اول روكن عێزەت عەبدولعەزیز: تۆپچی
٢- رەئیس (نقیب) بەكر عەبدولكەریم: تۆپچی
٣- رەئیس (نقیب) مستەفا خۆشناو: پیادە
٤- رەئیس (نقیب) میرحاج ئەحمەد: تۆپچی
٥- رەئیس (نقیب) عەبدولعەزیز شەمدینی: سوارە
٦- ملازم اول جەلال ئەمین: تۆپچی
٧- ملازم اول نوری ئەحمەد تەها: تۆپچی
٨- ملازم اول محەمەد ساڵەح ژاژەڵە: هەندەسە
٩- ملازم اول خێروڵڵا عەبدولكەریم: دروع
١٠- ملازم اول ثانی محەمەد قودسی: تەموین و ئیعاشە
١١- ملازم اول عەبدولرەحمان نەقیب: تەموین و ئیعاشە

لیستەی نێوەکان ئامادە کرا و چەند رۆژێک خەریکی مەشق پێکردن بووین، یەکێک هات و ئاگاداری کردم کە پێشەوا فەرموویەتی بچمە لای، چاوەڕوانم دەکات، منیش بە کاک جەلالم ووت کە دەچمە خزمەت پێشەوا، ئێوەش کە لەمەشق پێکردن تەواو بوون بگەڕێنەوە ناو شار. لە خزمەت پێشەوادا عەقید روکن عەلێیڤ، مەحەمەد حوسێنخان، کاک عێزەت عەبدولعەزیز و میرحاجیشی لێ بوون. پێشەوا رووی تێکردم و ووتی: "نیازمانە هەندێک تۆپ پەیدا بکەین، لەبەر ئەوە پێویستیمان بەو ئەفسەرە تۆپچیانەیە کە لەگەڵتان دان. کاک عێزەت و کاک میرحاج رازین، بەڵام پێمان خۆشە کە بیرو رای ئێوەش بزانین، ئەوجا تۆ چ دەڵێی"؟

لەوەڵامدا پێم ووت: "جەنابی پێشەوا ئێمە چ لێرە بین و چ لە هەر جێگەیەکی دیکەی کوردستان، خۆمان بۆ خزمەتی کورد تەرخان کردووە. بەڵام ئێمە لەگەڵ جەنابی مەلا مستەفا هاتووینەتە ئێرە و لە ژێر فەرمانی

ئەو داین، بە تایبەتی وەک جەنابتان ئاگادارن کە چەند رۆژێک لەمەو بەر بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا پارتی دیموکراتی کوردستانی – عێراقمان دروست کردوە، ئەمەش پەیوەندییەکی دیکەمانە بە مەلا مستەفاوە، لەبەر ئەوە وای بە باش دەزانم کە سەبارەت بە هەڵسووڕاندنی ئەم کارە جەنابتان داوا لەمەلا مستەفا بکەن کە دڵنیام لەوەی ئەویش گەلێکی پێخۆش دەبێت و ئامادەی جێ بەجێ کردنی هەمو فەرمانەکانتانە". پاش ئەوەی لە قسەکانم بوومەوە، هەموو تەماشای یەکدیان کرد و وەڵامەکەی منیشیان تەرجوومەی زمانی رووسی کرد بۆ عەلییێڤ، ئەویش زەردەخەنەیەک گرتی و وایان نیشاندا کە قسەکانی منیان بە دڵ بێت. ئەوجا پێشەوا فەرمووی کە لەو بارەوە چاوی بە مەلا مستەفا دەکەوێت. پاشان لەگەڵ عێزەت و میرحاجدا چووینە دەرەوە.

لە رێگە بەدەم قسەکردنەوە میرحاج پێی ووتم کە من کارێکی چاکم کردووە و ئەوان پێیان شەرم بووە ئەو قسانە پێشکەش بە پێشەوا بکەن و لەبەر ئەوەش بوە کە هەر زوو بەو داوایەی پێشەوا رازی بوون. پێم ووتن کە چۆن ئێوە بێ رەزامەندی مەلا مستەفا ئەو کارە دەکەن، هەڵبەتە دەتانەوێ کە لێی جودا ببنەوە کە من پێم وایە ئەمەش بێ وەفایییەکی گەورەیە، جگە لەوە ئێمە دەتوانین لەگەڵ هێزی بارزانییەکاندا خزمەتێکی گەورەتر و گرنگ تر بکەین. هەر چەندە ئەوان بە قەناعەتەوە پێشانیان دا کە هیچ نیازێکی جودابوونەوەیان نەبووە لەگەڵ مەلا مستەفادا. سەر لە نوێ ئەوەم بۆ جەخت کردنەوە کە ئەوە شتێکی جوان نییە بێ پرسی مەلا مستەفا هیچ جۆرە کارێک بکەین. بە تایبەتی کە ئێمە ئەندامین لە پارتی دیموکراتی کوردستانی – عێراقدا.

رۆژی دوواتر پێشەوا بۆ ئەو مەبەستە و هەندێ کاری دیکە لەگەڵ مەلا مستەفادا کۆبۆوە. ئەنجامی کۆبوونەوەکەیان هەروەک مەلا مستەفا ئاگاداری کردین بەم چەشنە بوو:

پێشەوا داوای کردووە پارتی دیموکراتی کوردستانی – عێراق کە لە

مەهاباد دامەزراوە لەبەر چەند هۆیەک هەڵ بوەشێتەوە.

١- دروست بوونی ئەو پارتیە بۆ کوردستانی عێراق گیروگرفتێکی سیاسی بۆ کۆماری ساوای مەهاباد دروست دەکات. دوژمنانی کۆمار بە تایبەتی تورکیا و عێراق کە وولاتە سوێند خۆرەکان پشت و پەنایانن، ئەم کارە، واتە دروست بوونی پارتی لەو بەشەدا دەکەنە بەڵگەیەک تا لەوولاتانی پاڵپشتیان و دونیاش بگەیەنن کە کۆماری مەهاباد لە ئێستەوە هەوڵی ئاژاوە نانەوە دەدات لەو دوو پارچەیەی دیکەی کوردستاندا و بە مەبەستی دروست کردنی کوردستانی مەزن لە هەر چوار پارچەکەدا. هەروەها پێشەوا بە مەلا مستەفای فەرمووبوو: کە دروست بوونی پارتی بۆ کوردستانی عێراق لەم کاتە ناسکەدا زیانێکی گەلێک گەورە بە کۆماری مەهاباد دەگەیەنێ و مەترسی‌یەکی زۆریشمان بۆ دروست دەکات، هەر چەندە کە دەشزانین ئامانجی دووا رۆژمان ئەوەیە کە هەمو کوردستانی مەزن ببێتە یەک پارچە و یەک کۆمار.

٢- پارتی ئێمەش (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران - پێشەوا دەفەرمویّ) پارتی دیموکراتی هەمو کوردستانی مەزنە. هەرچی کۆمەک و یارمەتی و پشتگیریەکیش لە کوردستانی عێراقەوە بێت ئەوا لە رێی کۆماری مەهابادەوە بە ئێوە دەدرێت.

پاش ئەوەی کە مەلا مستەفا بیروڕاکەی پێشەوای پێگەیاندین، خۆشی فەرمووی "منیش وا بە بەرژەوەند دەزانم کە پارتی هەڵ بوەشێتەوە". ئێمەی ئەندامانی پارتیش بەگشتی بیروڕامان لەگەڵ مەلا مستەفادا کرد بە یەک و لەسەر فەرمودەی پێشەوا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقمان دا و پێکرا ئەو بڕیارەمان مۆر کرد.

## وتوویژی نێوان من و پێشەوا

هەفتەیەک بەسەر ئەم رووداوانەدا تێپەڕی بوو، کات دوای نیوەڕۆ بوو، خەریکی مەشق پێکردنی بارزانی‌یەکان بووم، تەتەرێک هات و ئاگاداری کردم کە حەزرەتی پێشەوا پاش نوێژی شێوان لەماڵەوە چاوەڕوانم دەکات بچمە خزمەتی.

کە چوومە ماڵی پێشەوا دیتم بە تەنێ نەبوو، لە دیواخانەکەیدا کازم عەلیێڤ، محەمەد حوسێن خانی ئامۆزای و نانەوازادەش لە خزمەتی دابوون، پاش کەمێک دانیشتن پێشەوا دەستی بە قسە کرد و فەرمووی: "مەلا مستەفا نازی لەسەر هەموو کوردێک هەیە و خۆشەویستی هەموومانە و جێی رێزی هەموو کوردێکی بە شەرەف و دڵسۆزە. ساڵەهای ساڵە بەربەرەکانی دوژمنانی کورد دەکات و لە خەبات کردندا کۆڵی نەداوە و گیانی خۆی و هۆزەکەی خستوەتە مەترسی و دەردەسەری‌یەوە، لەم رێگە پیرۆزەدا چەندەها شەهیدی داوە. بەڵام وەک بیستوومانە کە لەم چەند رۆژەی دووایییدا کەمێک دڵگران و نیگەران بوە، ئەویش وەک ئێمە بزانین یەکێکی خائین دڵی مەلا مستەفای لە ئێمە رەنجاندووە. بەڵام لە راستی‌دا شتێکی وا رووی نەداوە تا مەلا مستەفا زوویر بێت، بەڵام دڵی لە کێ دەرەنجێ؟ ئێمە ئەو بە خاوەنی هەموو شت دەزانین، ئەو ئێستە پێشرەوی خەباتی گەلی کوردە و برای ئازیزی ئێمەیە، لەبەر ئەوە نابێ بە قسەی پیاوی خراپ لە ئێمە دڵتەنگ بێت، پێمان خۆشە کە ئەو خائینە لای خۆی نەهێڵی... هەروەها پێشەوا درێژەی بە قسەکانی داو فەرمووی: جارێ ژمارەی (٧٠٠) تفەنگ بۆ بارزانی‌یەکان وەربگرن، چونکە دەمانەوێ هێزێکی نیزامی بۆ یەکەم جار لە بارزانیەکان پێک بێنین و وورده وورده، لە داهاتوودا ئەم هێزە فراوان دەکەین. تا ئێستە هیچ هێزێکمان پێک نەهێناوە کە جێگای بڕوا و متمانە بێت و پشتی پێ ببەستین، ئەم هێزی بارزانی‌یانە دەبێتە بناغەی هێزی کۆماری کوردستان دەبێتە نێوەرۆکی

(نواة) ٢٣١ لکی نیـزامی، واته (٣ فـەوج)، تۆ لەگـەڵ ٣ ئەفـسـەری دیکەدا سـەرپەرشـتی ئەو ٣ لکە دەکـەن و دەتان نێـرینە بەرە (جـەبهـە)ی سـەقز کـە حـەمـە رەشـیـد خـان لەوێ فـەرمـاندەیە. تکامـان وایە کـە مـەلا مسـتـەفـا بەم کـارە رازی بێت". پاش تەواو بوونی پێـشـەوا لە قسـەکـانی، مۆڵەتم لێ وەرگرت و بیروڕای خۆم بەم چەشنە پێشکەش کرد:

"بەڕێز جـەنابی پێـشـەوا، ئەو ئەفـسـەر و ژمـارە کـەسـەی کـە لەگـەڵ بزووتنەوەی نیشتمانی دان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا ساڵەهای ساڵە یەکدی دەناسن و خەباتیان پێکەوە کردووە. وەک بەڕێزتان دەفەرموون، گەر گـومـان لێکراوێک لە نێـومـاندا هەبایە، هەڵبـەتە لەو مـاوە زۆرەدا بۆمـان ئاشکرا دەبوو و نەمـان دەهێـشت کـە لە نێـوانماندا بمێنێـتـەوە، بۆیە داوای بەخـشـینتـان لێ دەکـەم وە(جـورئەت)ی ئەوەشم تێـدایە کـە بە جـەنابتـان رابگەیێنم ووشـەی (خـائین) بەڕاست نابینم کـە بە هیچ یەکـێک لەو برادەرانەمـان بـووترێ. چونـکە (خـائین) تاوانێکی زۆر گـەورەیە سـزاشی توندە.

برادەرانی ئێمە چ ئەفسەر و چ ئەوانی دیکە کە لەگەڵ مەلا مستەفا دان گەلێک نیشـتمـان پەروەر و دڵسۆز و پاکن، جـا رەنگ هەیە لە نێـوانماندا هەبێت کـە بیـروڕای لەگـەڵ زرووفی ئێسـتـەی جـەنابتـاندا نەگـونجێ، جگە لەوەی کە بیروڕای هەموو کەسێک لە خەباتکردندا وەک یەک نیە، رەنگ هەیە کە بیری چەپی هەبێت و لەم رێگەیەوە بیانەوێ خەبات بکەن یاخود کـەسـێکی دیکە رێگەیەکی دیکە لە خـەباتکردنیـدا پەسـەند بکات، بەڵام ئامانجی گشتی لامان پاراستنی کۆمارەکەمانە و خزمەت کردن بەکورد و کوردستانە".

پاشان ئەوەشم بە خزمەت پێشەوا راگەیاند کە گومان لەوەدا نیە بارزانی بەڕێز هەمیـشـە ئامـادەیە بۆ جێ بەجێ کـردنی فـەرمـانی پێـشـەوای مـەزن فـەرمـایشـەکـانیشـتـان بە مەلا مـسـتـەفـا دەگەیەنم. ئەوجـا فـەرموی کـە بۆ بەیانی ئامادە بین و چەکـەکان وەربگرین و سلاویشی پێشکەش بە مـەلا

مستەفا کرد کە پێی رابگەیەنم.

شەو درەنگی بەسەردا هاتبوو کە لە خزمەت پێشەوا چوومە دەرێ. بەڵام بڕیارم دا کە هەر ئەو شەوە بچمە لای مەلا مستەفا. پاش ئەوەی سڵاوی پێشەوام بە مەلا مستەفا گەیاند، پێم ووت: "پێشەوا دەفەرمووێ کە مەلا مستەفا لێرە میوان نیە، بەڵکو خاوەنماڵە. پێویستیش ناکات دڵی لێمان زویر بێت بە قسەی یەکێک کە دوور نیە مەبەستێکی تایبەتی خۆی هەبێت یاخود زرووفی سیاسی ئێمە نەخوێنێتەوە". بەڵام ئەوەی راستی بێت بە مەلا مستەفام ووت کە دەبێ مەبەستی پێشەوا لەو کەسە کێ بێت؟ بارزانی فەرمووی مەبەستی لە هەمزە عەبدوڵلایە و ئێمەش تاقی دەکەینەوە.

ئەوجا مەلا مستەفا پێی ووتم کە سڵاو ورێزی بگەیەنمە پێشەوا و پێی بڵێم بارزانی لە ژێر فەرمانی ئەو دایە و ئامادەیە بۆ جێ بەجێ کردنی هەموو فەرمانێک. بەڵام وەک تێگەیشتم متمانەیان بە حەمە رەشید خان نەبوو، بۆیە دەیانویست بارزانی بنێرنە نێوچەی سەقز.

پاش دوو رۆژێکیش مەلا مستەفا هەمزەی رەوانەی کوردستانی عێراق کردەوە و تفەنگێکیشی دایێ کە بۆ خەرجی رێگە بیفرۆشێ.

## دابەشكردنی هێزی بارزانییەكان

مەلا مستەفا بارزانییەکانی کۆکردەوە و کردنی بە (٣) بەشەوە، هەر بەشەی (١٠٠) کەس. لەسەر خواستی مستەفا خۆشناو و خۆی، بەشی یەکەمی (مستەفا بروزی) درا بەو، بەشی دووەمی (ساکوکانی لە نجی) درا بە میرحاج ئەحمەد و بەشی سێیەمی (حەمەدئەمین میرخان و مامەند مەسیح) بەر من کەوتن.

پاش دوو رۆژێک کە ئیدی تەواو ئامادەبووین بەرەو گوندی سەرا (کەوتووەتە سەر رێگای نێوان بۆکان و سەقز) رۆیشتین. لەسەر بنکەی حەمەرەشید خانی لێ بوو و بەر پرسیاریی ئەو نێوچەیە و (گوندی سەرا) و دەوروبەرەکەی درایە دەست من. گوندی ئەحمەد ئاوا و دەوروبەرەکەشی بۆ مستەفا خۆشناو دیاری کرا و گوندی ئاڵتوونی ژووروو بۆ لکی میرحاج دیاری کرا، کاک جەلال ئەمینیش لای من مایەوە بە نێوی پەیوەندی لە نێوان هەر سێ بەشە (لکە) بارزانییەکاندا.

سەبارەت بە لکەکەی من، دەست و برد بنکەیەکم لە گوندی سەرچاوە دامەزراند و کردم بە دوو بەشەوە. هەر بەشەی (٥٠) بارزانی کە یەک بەر پرسیاریان هەبێت. بەرپرسیاری ئەو دوو بەشەش حەمەدەمین میرخان و مامەند مەسیح بوون (واتە فەرماندەی پەل بوون). هەر پەلەش (سریەیەک) لە (٥) دەستە پێک هێنرا و هەر دەستەیەکیش پێک هاتبوو لە (١٠) سەرباز.

سەرچاوە گوندێکی خۆش و ئاوەدان بوو، دەوروبەری ١٦٠ ماڵ دەبوو. گوندی (سەرا)ش کە حەمە رەشید خانی لێ بوو، دەوری ٣٠٠ ماڵ دەبوو. باخ و باخاتێکی زۆر و ئاسیاوی تێدا بوو. گوندی ئەحمەد ئاوا و دوو گوندی دیکەش موڵکی حەمەد ئاغای عەباسی ئەندامی پەرلەمان بوو کە لە دەست حەمە رەشید خان هەڵاتبوو بۆ سەقز.

هەر وەک دانیشتوانی گوندەکان باسیان دەکرد حەمەد ئاغای عەباسی مرۆڤێکی خوێندەوار و هۆشمەند بوو و لەگەڵ خەڵکەکەدا باش بووە و ئەوانیش گەلێکیان خۆش ویستووە.

وەک باسیان دەکرد حەمەد ئاغا لە روی دارایییەوە گەلێک دەست رۆیشتوو بووە، تەنانەت بۆ ماوەی (٦) مانگ خزمەتێکی زۆری حەمەرەشید خان و چەکدارەکانی کردووە. کەچی لە بری پاداش و چاکە دانەوە چاوی بڕیوەتە موڵک و سامانی و ناچاری کردوە سەرا بەجێ بێڵێ. ئەویش هیچی پێ نەکرابوو و هەڵاتبوو بۆ سەقز.

سامان و بەروبوومی زەوی و باخ و ئاسیاوەکانی حەمەد ئاغا ساڵانە دوو ملیۆن تمەن بووەو حەمە رەشید خان دەستی بە سەردا گرتوە. لە ئەنجامدا بۆم روون بۆوە کە حەمەد ئاغا هیچ تاوانێکی نەبووە تا ئەو هەڵوێستەی بەرامبەر بنوێنرێ، تەنێ ئەوە نەبێت کە خاوەنی دارایی و سامانێکی زۆر بووە.

دوو رۆژێک تێپەڕی کرد بوو کە لەسەرچاوە دامەزرابوین، حەمە رەشید خان و مستەفا خۆشناو میرحاج هاتن بۆ لامان. هەموو پێکەوە بەن یوچەکەدا گەڕانێکمان کرد و پاشان بەسەر هەر سێ لکەکەدا، هەر یەکە پارچە (قاطع)ی لێپرسراوێتی پاراستنی بۆ دیاری کرا.

١- رێگەی سەرا - سەقز بە لای قاراوا و سەرچاوە درایە لکی (١) یەکی سەر بە من.

٢- لە رێگەی سەقزەوە بۆ ئاخکەند و دەوروبەری درایە لکی (٢) دووی سەر بە مستەفا خۆشناو.

٣- لە سنوری ئەوێشەوە، لە ئاڵتوونی ژووروو و دەوروبەرەکەی درایە لکی (٣) سێی سەر بە میرحاج.

پاش سنور دەستنیشان کردن، ئیدی هەر (٣) پەلەکەم دابەش کرد و هەر چڵەش بەرپرسیار بێت لە پاراستنی پارچەکەی خۆی. (٢٥) رۆژێک

تێپەڕیبوو، سەرلەنوێ حەمەرەشید خان و مستەفا خۆشناو و میرحاج هاتنەوە سەرچاوە بۆ لام. نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بەرەو زوورگەکانی سەر بە گوندی قاراوای ڕێگەی نێوان سەرا – سەقز ڕۆیشتین. لەسەر بەرزاییەک کە پێی دەوترا (کەلی بێژینگ بەسەر) دانیشتین و دەستمان کرد بە ووتوێژ. خاڵی هەرە گرنگی باسەکەمان ئەوە بوو: لە کاتی هێرش کردنی سوپای ئێران، بۆ سەر ناوچەکەمان هەر لکە کاری چی بێت و چۆن یارمەتی یەکدی بدەین و بە چ شێوەیەک بەرەنگاریان ببینەوە؟ بە واتایەکی دی چۆنێتی دانانی پلانێک بۆ بەرگری کردن.

کەلی بێژینگ بەسەرو یەک دوو بەرزایی دیکەش ڕێگەی وایان هەبوو کە لە کاتی شەڕدا تانکی دوژمن دەیتوانی سوودیان لێ وەربگرێ، ئەو بەرزاییانەش لە شوێنە دیاری کراوەکانی مستەفا خۆشناودا بوون. ئەوجا بەرپرسیارێتی پاراستنی ئەو نێوچانەشیان خستە ئەستۆی من. هەر ئەو دەمە منیش بە بەرد لەسەر شێوەی سەنگەری دژ بە تانک بە جۆرێکی زیگزاک و هی تر زەوییەکم دیاری کرد. چەند جێیەکی سەنگەریشم بۆ حەمەدەمین خان و مامەند مەسیح دەسنیشان کرد کە لە ئایندەدا هەڵی بکەنن و ئامادەی بکەن بە جۆرێک کە تانک لەو جێگایانەوە نەتوانێت تێپەڕ بێت. هەر پەلەش چەند بارزانییەکی لێ دابنێت و فیشەکی تانک بریان پێ دەبێت. بۆ ئێوارەش گەڕاینەوە سەرچاوە.

ڕۆژی دوایی سەر لە بەیانی حەمەدەمین خان و مامەند مەسیح، هەریەکەیان بە (١٢) دوازدە چەکدارەوە چوونە کەلی بێژینگ بەسەر بۆ هەڵکەندنی سەنگەرەکان.

## هێرشی سوپای ئێران بۆ سەر هێزەکانمان

ستونێکی سەربازی ئێرانی کە بریتی بوو لە (هەنگێک) لە سەقزەوە دەرچوو و گەیشتە ئاڵتوونی ژێروو و بەرەو قاراوا و سەرا دەهات. دەست بەجێ حەمەدەمین و مامەند بە خۆیان و چەکدارەکانیانەوە دەچنە لای ئەو (٦) شەش چەکدارەی دیدەبانێک و (مرصد) دامنابوون.

ئەم جێگەیەش لەسەر بەرزاییەک بوو کە بەسەر قاراوا و رێگەی نێوان سەقز و سەرادا دەینواڕی، بە گورجی وەڵامیان بۆ ناردم کە دوژمن بە فڕۆکە و چەکی قورسەوە هێرشی هێناوەتە سەر نێوچەکە و چاوەڕوانی فەرمانی من دەکەن، کە گەیشتمە لایان، هەندێکیشیان گەیشتبوونە بەری ئاڵتوونی ژووروو. ماوەی دوو کاتژمێرێک ئەو نێوچەیەم تەواو پشکنی و بارزانیەکانم لە سێ جێگە دامەزراند. پەلەکەی مامەندم لە بەرزاییەکەوە بەسەر رۆژهەڵاتی قاراوا و حەمەدەمین میرخانم لەسەر بەرزاییەکی بەرامبەر گردێکی خوارووی قاراوا بە لای سەقزدا، دامەزراند و خۆشم لەگەڵ (٤) چوار چەکدار لەسەر گردێک، بەرامبەر قاراوا لە نێوان ئەو دوو شوێنەی مامەند و حەمەدەمین و رووبەڕووی ئەو گردەی کە بە تەنیشت گوندی قاراوا بوو دوو (مسلسل) رەشاشی گەورەی بڕنەوی دوژمنی لێ بوو، دامەزراین.

دوو تۆپی دوژمن کە لەو بەری چەمی ئاڵتوون بوو لە دامێنی چیاکەوە گوللە بارانی کردین ، شایانی باسە ئەو لکەی کە لەگەڵ من بوون زۆربەیان تووشی نەخۆشی تیفۆ و مالاریا ببوون. تەنێ ئەو (٢٤) بارزانی‌یەی کە لەگەڵ حەمەدەمین و مامەند دا بوون، سەلامەت بوون لەگەڵ ئەو چوار (٤) نەفەرەی خەڵکی سەرچاوە کە لە دیدەبانەکە بوون. هەروەها حوسێن هوستانی کە تازە لە نەخۆشی بەسەر پێ کەوتبووەوە و حەمەد ئاغای دۆڵەمەریش بە خۆی و دەستەکەی کە ئەوانیش تازە لە نەخۆشی راست ببوونەوە، ئیدی لەوان زێتر کەسی دیکە نەیتوانی بگاتە جێگەی شەڕەکە.

ئەوجا ئەوانەم ناردە سەر ڕێگەیەک کە لە سەقزەوە دەچێت بۆ "کانی نیاز" و لەوێوە بۆ "کونە کۆتر" کە دەکەوتە لاشانی چەپمان، لەوێ دامەزراین نەک دوژمن لەو لاییەوە بێت و ئابلۆقەمان بدات.

شەڕ لە گەرمەی دا بوو وەڵامم بۆ حەمە ڕەشید خان نارد کە ڕەشاشێکمان بۆ بنێرێ چونکە جگە لە تفەنگ هیچ جۆرە چەکێکی دیکەمان نەبوو. هەروەها ئەوەشم بۆ نووسیبوو کە ئاگاداری کاک مستەفا و کاک میرحاج بکات لای خۆیان قایم بکەن و ئەگەر بتوانن لە لای ئاڵتوونی ژوورووە، هێرشێک بکەنە سەر لاشانی دوژمن، بەڵام ئەو کارە ڕووی نەدا. لە دواییدا بیستم حەمە ڕەشید خان کە گوێی لە دەنگی تۆپ و فڕۆکە دەبێت هەوڵ دەدات کە سەرا بەجێ بهێڵێت و بەرەو دوا بکشێتەوە، بەڵام میرحاج چووبووە لای و نەیهێشتبوو پەلە بکات و پێی ووتبوو کە چاوەڕوان بکات تا ڕاپۆرتی عەسکەری لای کاک "بەکر"ەوە بە دەست دەگات و وەزعەکە ڕوون دەبێتەوە. شایانی باسە کە ڕەشاشەکەش بۆ من نەهات.

سێ (٣) کاتژمێر دەبوو لە گەرمەی شەڕدا بووین کە فەرمانی هێرش بردنە سەر گوندی قاراوام لە دوو لاوە دا. مامەند مەسیح لای ژووروو، حەمە دەمین لای ژێروو بە لای سەقزدا و خۆم و ئەو سەربازانەی کە لام بوون بە شەستیری تفەنگ ئەو گردەی کە دوو ڕەشاشە برنەوەکانی دوژمنی لەسەر بوو، لێمان دان و سەرمان لێ شێواندن. لە نێوان ئەو گردانەی قاراوەوە کە مامەندی لەسەر بوو تا گوندی قاراوا دەشتێکی ڕووت بوو بە درێژایی (٢٠٠) مەتر، ئاگری دوژمن بە سەرماندا دەباری. یەکێک لەسەربازەکانی مامەند مەسیح بە نێوی عەبدوڵڵا خۆشناو کە گەنجێکی زێدە ئازا و جەربەزە بوو (تا قوتابخانەی نێوەندی خوێندبوو) کاروباری ئازووقەم پێ سپاردبوو، هێرشی سەر گوندی قاراوای کرد. لە خزمەکانی مامەندیش (سیامەند و مەلا شەفیق) بە پەلە ئەو (٢٠٠) مەترە دەشتاییەیان بڕی و خۆیان هاویشتە نێو گوندی قاراوا و پشتیان لە دوو

ڕەشاشە گەورەکانی دوژمن گرت. لە هەمان کاتدا فەرمانمدا بە (٣) کەس لەو دوو بارزانییانەی لای من بوون لەگەڵ حوسێن هوستانی دا و هێرشی سەر هەمان دوو ڕەشاشە گەورەکەیان کرد. حەمەدەمین میرخانیش هێرشی بردە سەر ئەو گردەی باشووری قاراوا کە لە ملی نێوان هەردوو گردەکەدا بوو، ژمارەی (١٦) شازدە سەربازی دوژمن کە لەسەر ڕەشاشەکە بوون و هەڵدەهاتن، کوژران. من و ئەو سەربازەی کە لام مابۆوە خۆمان گەیاندە لای حەمەدەمین میرخان. یەک لەو سەربازە کوژراوانەی دوژمن کە لەوێدا کەوتبوون لە ڕێی ناسنامەکەیەوە زانیمان کە نێوی "محەمەد ئەسغەری"یەو ملازم ثانی بوو و دەمانچەیەکی قۆناغداری بە قەدەوە بوو.

هەر ئەو دەمە عەبدوڵڵا خۆشناو و ئەو دوو بارزانییەی لەگەڵیدا بوون کە گەیشتنە سەر ڕەشاشەکان و دەستگیریان کردن و پاشان هێرشیان بردە سەر ئەو دوو تۆپەی کە لەوبەری چەمی ئاڵتووندا بوون، بەڵام دوژمن بە پەلە تۆپەکانی ڕزگار کرد و بەرەو چیای مەلقەرەنی هەڵاتن. دووای ئەوە تەلەفۆنێک، جیهازێکی لاسلکی، دوو ڕەشاشی سەرتۆپ، ١٤ گوللە تۆپ، چەند بازنەیەکی تەلی تەلەفۆن و ژمارەیەک لاشەی لێ بەجێ ماو (٦) شەش سەربازیشیان بە دیل گیران. هەر ئەو دەمەش کاک میرحاج بە خۆی و (٢٠) بیست کەسەوە گەیشتبووە لای عەبدوڵڵا خۆشناو و دوو ڕەشاشەکەیان لێ وەرگرتبوون. لەبەری (جەبهەی) من و حەمەدەمین میرخانیشەوە دوژمن شکستی هێناو هەڵاتن و ئێمەش هەر لەو دەشتە ڕوتەڵەیەدا بووین.

لەگەڵ بانگی ئێوارە دا ئابلۆقەی گوندی ئاڵتوونی خواروومان دا، لەوێ مەخفەرێکی جەندرمە (پۆلیس)ی لێ بوو، کە گەیشتینە ئەوێ ئەوان هەڵاتبوون. مەخفەرەکە پڕی ئازووقە بوو، دوو ئەسپیشمان لەوێ دەستکەوت بوو. سەربازەکانی دوژمن بەرەو چیای مامەشەو سەقز هەڵاتبوون. (٨) سەربازیش لە چیای مامەشە بە دیل گیران. بە کورتی دەستکەوتمان لەو شەڕەدا ئەمانەی خوارەوە بوو: ٤٢ دیل، ١٦٠ تفەنگی

برنەو، ١٤ گـولله، تەلەفـۆنێک، جیـهـازێکی لاسلکی، ٣ مـیل تەلی تەلەفـۆن، (٤) رەشـاشـی برنەو دوانیـان گـەورە، گـەنم و جـۆیەکی زۆری مـەخفـەری ئاڵتـونی خـواروو، دوو ئەسپ، بەتانی و کـەل و پەلێکی زۆر، فیشەکێکی زۆر، پتر لە (١٠٠) کوژراوی دوژمن.

زیانی ئێـمە لەو شەڕە سەختـەدا و جێ ناهەمـوارە دەشتـاییـیە، بەو چەکە سووکەڵەی کە هەر تفەنگ بوو، نە کوژراومان بوو نە بریندار، پاش ئەوەی کە دوژمن لە گوندی قـاراوا هەڵات و ژمارەیێکیان لێ کوژرا، گەر مامەند مەسیح و پەلەکەی خەریکی کەلوپەل و دەستکەوت کۆکردنەوە نەبوونایە و وەک حەمەدەمین میرخان بەردەوام بوونایە لەسەر هێرش بردنە سەر دوژمن کـە هیچ ورەیـان نەمـابوو، ئەوا رەنـگ هەبوو کـە هێـزی دوژمـن هەمـووی بە دیل بگیرانایە، بەڵام مەخابن ئەوەش رەوشتێکی ناشرینی کوردەوارییە کە لە ئەنجامی سەرکەوتنی نیوە ناچڵدا دەکەوێتە تاڵانی دەستکەوتەکان، لە بری ئـەوەی لە هەڵاتنی دوژمن سـوود وەربگرێ و بە دوایدا بـچـێت و رێی حەسانەوەی نەدات تا جارێکی دیکە خۆی قایم بکاتەوە و هێرش بەریتەوە و وەک لە عەسکەریدا پێی دەڵێن: (استثماری فەوز). جێگەی داخە کە مامەند لە قاراوا جووڵەی نەکرد.

ئێمەش ئەو شەوە لەگەڵ حەمەدەمین میرخان لە گوندی ئاڵتوونی خواروو مـاینەوە، رۆژی دوایی سـەر لە بەیانی راپۆرتێکی عـەسکەریم بە دوور و درێژی سەبارەت بە شەڕەکە بۆ حەمە رەشیـد خان و بەڕێز وەزیری جەنگ حەمە حوسێن خان و مەلا مستەفا نارد و دیلەکانیشمان رەوانەی مەهاباد کرد.

رۆژی دواتر بەڕێزان: پێشەوا، حەمە حوسێن خان، مەلا مستەفا و حەمە رەشـیـد خـان هاتن بۆ گـوندی ئاڵتـوونی خـواروو. پیـرۆزباییـیـان لە جەنگاوەرەکانی ئەو شەڕە کرد و مەلا مستەفا فەرمووی:

"کـە هەواڵم بە دەست گـەیشت لکی (٣)، ئەم شـەڕەی کـردووە، ووتم لەوانەیە دوو بەشی شـەهیـد بووبێن ئەمـەش لوتفی خـوایە کـە بەبێ زیان

دەرچون، هەر کەسێ ئەم جێگە ببینێ، هەرگیز ناچێتە عەقڵییەوە کە چەند سەربازێکی کورد ئەو شەڕە قورسە دژی فڕۆکەو تۆپ و چەکی قورس بکات. سەد سوپاس بۆ خوا" پێشەوا فەرمووی:

"چونکە لەسەر هەقین، لە شکری خواییمان لەگەڵە و دەمان پارێزێ". هەر ئەو ڕۆژە بەڕێزان بەرەو مەهاباد گەڕانەوە. ڕۆژی دوای ئەوە بەڕێز پێشەوا نامەیەکی پیرۆزبایی و (۹۰۰۰) تمەن و چوار غەداری کۆڵتی بە دیاری بۆ ناردم. بەڕێز مەلا مستەفاش نامەیەکی پیرۆزبایی و تفەنگێکی برنەوو دەمانچەیەک. بەڕێز سەرەک وەزیران (حاجی بابەشێخ) ئایەتێکی قورئان ( وکم فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بأذن اللة) کە بە ئاوی زێڕ نوسرابوو بۆی ناردم. کاک سەدیق حەیدەری دەستە بەرگێکی کوردی کە بریتی بوو لە : کولەجە و شەرواڵ و پشتێن، شەدەی سەر و کاڵە کۆبیانەیەکی سەر بە ئاوریشم چندراوی لەگەڵ نامەیەکی پیرۆزبایی بۆ ناردم. ئەو چوار غەدارەیەی کە پێشەوا بۆی نارد بووم، یەکێکم بۆ خۆم گل دایەوە، ئەوانی دیکەم دایە کاک مستەفاو کاک میرحاج و کاک جەلال. هەروەها (۹۰۰۰) تمەنەکەم بەسەر لکەکەی خۆم و ئەوانی دیکەدا دابەش کرد. لە ماوەی (۳) ڕۆژدا هەموو نێوچەکەمان تا ڕێگەی بانە خاوێن کردەوە و کەوتە ژێر دەسەڵاتی خۆمان. لەبەر فراوانی نێوچەکە بە چاکمان زانی کە سەر لە نوێ بەرپرسیارێتی پاراستنی بەسەر هەر (۳) لکەکە (بەتالیۆن)دا، دابەش بکەینەوە. بەتالیۆنی سەر بە من لە ڕێگەی قاراوا تا سەقز بە دەستی چەپیدا بەرکەوت. بەتالیۆنی یەکی مستەفا خۆشناو لە ئاڵتوونی ژوروو تا چیای مامەشەی، بەرکەوت. بەتالیۆنی دوو میرحاجیش ڕێگەی نێوان سەقز – بانەی، بەرکەوت.

هەفتەیەک تێپەڕی کردبوو بەسەر ئەو سەرکەوتنەماندا. فەرمانێک لە لایەن پێشەواوە دەرچو کە ئیدی دەبێت بەتالیۆنەکان شێوەی سەربازی وەربگرن و جل و بەرگی سەربازی لەبەر کەن و پلە (روتبە)ی سەربازییان هەبێت.

رۆژێک نامـەیەک و دەسـتـێک جل و بەرگی سـەربـازیم لە لایەن بەرێز وەزیری جەنگ حەمە حوسێن خانەوە بۆ هات. نامەکەی بەم جۆرە بوو:

بۆ بەرێز پەدپەڵکۆڤنیک بەکر عەبدولکەریم

دوای سڵاو

لەسەر فەرمانی حەزرەتی فەرماندەی مەزن و پێشەوای بەرێز دەرەجەی پەدپەڵکۆڤنیکت پێ بەخشرا لەسەر ئەو پاڵەوانێتی و فیداکاریەی کە لە شەڕی قاراوادا نواندووتانە. داوا لە خوا دەکەین هەمیشە سەرکەووتوو بن و بتانپارێزێ.

**ئیمزا**

**وەزیری جەنگ**

ئەم دەرەجانەی خوارەوەش بە ئەفسەر و پەل و دەستەکان درا:

١- مەلا مستەفا: مایۆر (مێجەر) ژەنراڵ.

٢- حەمەد ئاغا مێرگەسووری: پەڵکۆڤنیک (عەمید)

٣- عێزەت عەبدولعەزیز: پەدپەڵکۆڤنیک (عەقید)

٤- بەکر عەبدولکەریم: پەدپەڵکۆڤنیک (عەقید)

٥- مستەفا خۆشناو: پەدپەڵکۆڤنیک (عەقید)

٦- میرحاج ئەحمەد: پەدپەڵکۆڤنیک (عەقید)

٧- خێروڵلا عەبدولکەریم: مایۆر

٨- نوری ئەحمەد تەها: مایۆر

٩- جەلال ئەمین: مایۆر

١٠- محەمەد سالح ژاژڵەیی: مایۆر

١١- عەبدولرەحمان تەیبب: کاپیتان

١٢- حەمەد ئەمین میرخان: کاپیتان

١٣- مامەند مەسیح: کاپیتان

١٤- وەهاب محەمەد عەلی ئاغا: کاپیتان
١٥- مستەفا بروزی: کاپیتان
١٦- ساکۆ کانی لنجی: کاپیتان
١٧- میرزا رەشۆ: ئیستیوار
١٨- حوسێن هوستانی: ئیستیوار
١٩- حەمەد ئاغا دۆڵەمەری: ئیستیوار
٢٠- سەید محەمەد عەلی ئاغا: ئیستیوار
٢١- محەمەد قودسی: کاپیتان

لیستەی سەرپەل و دەستەکانی بەتالیۆنی (١) و (٢)، کە دەرەجەیان پێدرابوو، بۆیان نێردرابوو.

## هۆی نێوان ناخۆشی من و حەمەرەشید خان

حەمە رەشید خان کابرایەکی ناسرابوو لە ئێراندا و خاوەن عەشیرەت بوو. جا لەسەر هەرچی هۆیەک بووبێت چەند جارێک بە گژ حکومەتی ئێراندا چووە.

کۆماری مەهاباد بە چاکی زانی سوود لە هێز و ناوی وەربگرن، بە تایبەتی کە لە نێو عەشیرەتە کوردەکانی ئێراندا بە ناو و دەنگ بوو. وەک لە دواییدا دەرکەوت کە دەسەڵاتدارانی کۆماری مەهاباد زۆر متمانەیان بە حەمە رەشید خان نەبوو، چونکە شارەزای رەوشتی بوون و ئاگایان لە رۆژانی رابوردووی هەبوو کە چ مرۆڤێکە و لەوەش باش گەیشتبوون کە هەستی نیشتمان پەروەریەتیش نەبووە پاڵی بە حەمەرەشید خانەوە نابێت لە کۆماری مەهاباد نێزیکی بکاتەوە، لەبەر ئەوە زێتر مەبەستی کۆماریش تاقیکردنەوەی نێوبراو بووە.

کۆماری مەهاباد هەر (٣) بەتالیۆنی بارزانییەکانی خستە ژێر فەرماندەی حەمەرەشید خانەوە، بەڵام لە راستیدا ئەو شیاوی ئەوە نەبوو کە هێزێکی سەربازیی رێکوپێکی بەو چەشنەی بخرێتە بەردەست و سەرپەرشتی بکات و بەگژ حکومەتی ئێراندا بچێت، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو کابرایە فەرماندەی جەبهەی سەقز بوو. زێتر خەریکی پارە و پوڵ پەیدا کردن بوو، بیانووی بە دانیشتوانی نێوچەکە دەگرت و تاوانباری دەکردن تا زەوی و زار و داراییان داگیر بکات. هەر بەو چەشنەش حەمەد ئاغای عەباسی کە چەند مانگێک مەسرەفی خواردن و خواردنەوەی چەکدارەکانی دەکرد دەری پەڕاند بۆ سەقز و بە نرخی یەک ملیۆن تمەن تووتن و دەغڵ و دانەوێڵەی نێوبراوی بۆ خۆی فرۆشت و هیچیشی نەدابووە کۆماری مەهاباد،. جگە لەوە ٣٠-٤٠ کەسی لەو گوندانە خڕ کردەوە و تووتنی پێ دەچاندن. تەنانەت هێزی بارزانییەکان کە لە ژێر فەرماندەیی ئەودا بوون وەزعیان پەرێشان بوو، هیچیان نەبوو، مەسروفاتیان نەدەکرا. لەمەش

بترازێ حەمەد ئاغا هەندێک گەنم و جۆو کرێی ئاشی لە گوندی سەرچاوە مابوو، حەمە رەشید خان و هەڵسوکەوتی پیاوەکانی وایان لێ کردم کە فەرمان بە خەڵکی گوندەکە بدەم زێتر کەس نەچێتە بێگاری حەمەرەشید خان و گەر داوای بەردێکیش بکات کەس نەیداتێ، لیستەیەکیشمان بۆ ئەو دەغڵ و دانەوێڵەی حەمەد ئاغا دروست کرد کە لەوێ مابۆوە و سەرەتا دەستەبەری (تأمینی) خێزانەکەی حەمەد ئاغامان لە دانەوێڵە کرد و ئەویشی مایەوە پاش ئاگادارکردنی مەهاباد بەسەر هەر سێ بەتالیۆنی بارزانییەکاندا، دابەشمان کرد بەم جۆرە تا ماوەیەک پێویستیمان بە هیچ ئازووقەیەک نەما کە لەمەهابادەوە بۆ هێزەکانمان بێت.

هەر لەو دەمەدا مەلا مستەفا بۆ دیدەنی هاتبووە لامان و بەرگی ژەنەراڵیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بەڵام لەبەری نەدەکرد. هەوڵمان لەگەڵی دا کە لەبەری بکات و ئەویش دڵی نەشکاندین و گەلێک خۆشحاڵ بووین کە بەو بەرگەوە دیتمان و پیرۆزباییەکی زۆرمان لێ کرد. رۆژی دواتر مەلا مستەفا بەرەو بۆکان گەڕایەوە.

پاش ئەوەی کە نەمهێشت حەمە رەشید خان دەست بە سەر دەغڵ و دانی گوندی سەرچاوەدا بگرێ، گەلێک پەست و دڵگیر بوو لێم و هاتوو چۆی نێوانمان بڕاو کەوتە پیلان گێڕان دژ بە من.

کاتێک کە بنکەکەی خۆم گواستەوە بۆ گوندی قاراوا، ئاگاداریان کردم کە حەمە رەشید خان خەریکی هەڵخەڵەتاندنی چەند کەسێک بووە و لەگەڵ هەر کەسەش وا رێک کەوتبوو کە (٥) تفەنگی بڕنەو و(٥) دەمانچە و پەنجا هەزار تمەنیان بداتێ بۆ کوشتنی من. بەڵام خۆشبەختانە ئەو کارەی بۆ ئەنجام نەدرا، چونکە هێزەکەی من بارزانی بوون و پاسەوانەکانیشم هەر لەوان بون، لەبەر ئەوە بارزانییەکان ئەو تاوان و خۆ فرۆشییە ناکەن. ئەو کەسانەش کە بارزانی نەبوون، نەیان دەتوانی لە ئێمە نیزیک ببنەوە و زەرەرمان پێ بەرن. لەبەر ئەوە خان بەو ئاواتە نەگەیشت.

## شەڕی مامەشەی یەکەم

ڕۆژێک لە ناکاو دوژمن هێرشی بردە سەر گردی مامەشە، لەوێ چەند سەربازێکی بەتالیۆنی (۲)ی مستەفا خۆشناوی لێبو، ئازایانە و جەربەزانە توانییان پشت لەو هێزە بگرن و دوای شەڕێکی شێرانە دوژمنیان شکاند کە چەند لاشەیەکی کوژراویان لێ بە جێما و چەند کەسێکیشیان لێ بە دیل گیرا. فەرماندەی هێزەکەشیان کە سەروان خوسرەوی بوو کوژرا و ئیدی دوژمن بە سەرشۆڕی بەرەو سەقز گەڕایەوە.

دوای ئەوە بە (۳) ڕۆژێک چومە خزمەت پێشەوا لە مەهاباد. سەرهەنگ فیرۆزی کە سەرکردەی لە شکری (٤) بوو (ئەوە بە لەشکری کوردستان نێو دەبرا)و فەرماندەی ئەم لە شکرەش کە هەمایۆنی بوو هاتە مەهاباد بۆ داواکردنەوەی دیلەکانیان.

ئەو دەمە وتووێژ لە نێوان حکومەتی تاران و کۆماری میللیدا دەستی پێ کردبوو سەبارەت بە ڕێکەوتنێکی ئاشتیخوازانە لە نێوانیاندا. هەر لەو هەفتەیەدا محەمەد نانەوازادە بۆ هەمان وتووێژکردن چوو بووە سەقز، ئاگاداریان کردین کە لە فڕۆکە کەوتووتە خوارێ و شەهید بووە.

بەڵام وا ڕێک کەوت کە ئەو ڕۆژە من لەسەردانی سەربازەکانم بووم لە قاراوا - ئاڵتوون، دیتم کە فڕۆکەیەک لە سەقز بەرەو ڕێگەی سەقز - بانە هەستا و هێشتا ئاوا نەببوو کە دیتم لە فڕۆکەخانەکەی سەقز نیشتەوە. جا هەواڵەکەیان وا داینێ کە ئەو فڕۆکەیەی ئەوی تێدا بووە سووتاوە و کەوتۆتە خوارێ بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە پیلانی حکومەتی ئێران بوو، خۆ ئەگەر نا جگە لەو فڕۆکەیەی کە ئێمە دیتمان هیچ فڕۆکەیەکی دیکە لە ئاسماندا نەبوو یاخود لە سەقز بەرز نەبۆتەوە. ناچار دوای ئەو هەواڵە بروسکەیەکم بۆ حەزرەتی پێشەوا نارد کە لە ڕۆژنامەی کوردستانیشدا بڵاو کرایەوە. لەسەرەخۆشی کردنەکەدا گومانی خۆم بەرامبەر بەو کارە دڵتەزێنە پێشان داوە. ئەوەشم خستەوە خزمەت پێشەوا کە نانەوازادە، دوژمن

شەهیدی کردووە و کەوتنە خوارەوەی لە فڕۆکەدا بە ڕاست نازانم. داواشم لێ کردبوو کە ڕێگەم بدات تا تۆڵەی بستێنمەوە.

پاش تێپەڕ بوونی ئەو شەڕەی سەرمامەشە بە (١٠) ڕۆژ مەلا مستەفا لەسەرچاوە پەیدا بوو، کاک عێزەت و کاک جەلال ئەمینی لەگەڵدا بوون، مەلا مستەفا فەرمووی: "ئامادە بن بچن بۆ گوندی تەموتە (دەکەوێتە سەر ڕێی بانە - سەقز) کە حەمە ڕەشید خان ئێستە لەوێیە، ماوەی سێ مانگ دەبێت کە هێزێکی گەورەی شکاک و حەمە ڕەشید خان دەورەی بنکەیەکی دوژمنیان داوە (ئەو بنکەیە بەسەر دێی کۆنە تەمووتەوە دەنوارێ)و تا ئێستە نەیانتوانیوە ئەو پورگەیە لەوێ خاوێن بکەنەوە. جا وا فەرمانی حەزرەتی پێشەوام لەگەڵ خۆدا هێناوە کە بەتالیۆنێکی بارزانی لە بری ئەوان بەو کارە هەستێت، منیش ئێوەم بۆ بەجێ هێنانی ئەو کارە هەڵبژاردووە و سەرەتاش پێویستە ئەو نێوچەیە بپشکنین، هەروەها بەلای بەتالیۆنی (١) و (٢)شدا دەڕۆین چاوێک بە وەزعی ئەوانیشدا دەخشێنین گەر کەموکوڕیەکیان سەبارەت بە دامەزران و خۆ ئامادە کردن هەبێت ئەوا یارمەتییان دەدەین".

لەسەرچاوەوە ڕۆیشتین بۆ ئاڵتوونی خواروو، لەوێشەوە بە ڕێگەی گردی مامەشەدا سەرکەوتین. لە ناو دۆڵێکدا کە لەسەرەوە بەرەو خوار بۆ لای ئاڵتوونی خواروو دەکشا تووشی کاک وەهاب حەمەد عەلی ئاغای و پەلەکەی هاتین لە نێوان ئەمان و ئەو پەلەی کە بە سەر گردی مامەشەوە بوو بۆشایی و داپچڕانێکی زۆر هەبوو. بە درێژایی دۆڵەکەش هیچ جێگەیەکی دیکەیان لێ دیار نەبوو. ڕەشاشێکی ڤیکەرسیان بەرامبەر ڕێگەی ئاڵتوون دانابوو. ئێمەش جێگەی ڤیکەرسەکەمان لا پەسەند نەبوو، لەبەر ئەوە گواستمانەوە بۆ بەرزاییەک کە بە پشتی ئەو جێگەیەوە بو و لەگەڵ سەرتەپی مامەشەش یەکدییان لێ دیار بوو. پاشان چووینە سەر تەپی مامەشە، کە ئەمەش گردێکی رووتەڵەی بەرداوی بوو، لێرەوە شاری سەقز، گوندی ئاڵتوونی خواروو و دەور و بەرەکەی لێ دیار بوو، لە

خواریشەوە بەرووکاری سەقز تا سەرەوە، ئەو بەر هەرنجە هەمووی لەبەر چاو بوو، بۆ دامەزراندنی بنکەی خۆ پاراستن گەلێک رێک و پێک بوو بە مەرجێک سەنگەری قایم و باشی لێ ساز بکرایە. تەماشامان کرد کە (١٢) بارزانی بە رووکاری لوتکەی گردەکە هەندێک بەردیان لە ٢-٣ جێگەی نیزیک بە یەکدی کردووەتە لا دیوار و کەمێکیش خۆڵیان بە سەر دا کردووە. بە ئاشکرا دیار بوو کە ببوە نیشانەی زۆر باشی تۆپ لە سەقزەوە. لەبەر ئەوە پێمان ووتن کە ئێوە شەڕ لەگەڵ دووژمنێکدا دەکەن کە خاوەنی فڕۆکە و تۆپە دەبێت سەنگەر لە زەوی هەڵبکەنن و قوڵی بکەن تا گوللەی تۆپ نەتان گرێتەوە و سەریان لێ بشێوێن و بە پووش و پەڵاش دایبپۆشن و هەروەها لە لا شانی گردەکەش دەبێت سەنگەرتان هەبێ و جگە لە بۆشایی‌یەک کە لوولەی تفەنگی لێ بچێتە دەرەوە و بەر چاوی خۆتانی تێدا ببینن نابێت چیتر بە دەرەوە بێت. لەمەش بترازێ بۆشایی‌یەکی زۆر لە نێوان ئێوە و کاک میرحاجدا هەیە و ئێوەش ژمارەی سەربازەکانتان کەمە و دەبێت بە چەند کەسێک ئەو بۆشایی‌یەی نێوانتان پڕ کرێتەوە، خۆ ئەگەر نا دوژمن دەتوانێت لەوێوە ئابلۆقەتان بدات و ئێوەش بە فریای یەکدی ناکەون، جگە لەوە دەبێت لە پشت گردەکەش سەربازی (إحتیاط) دابنرێت و بە هیچ جۆرێک چۆڵ نەکرێت.

ئەوانمان جێ هێشت و چووینە لای کاک میرحاج لەسەر چەقی رێگەی سەقز - بانە. لەو دەشتە بۆشایی‌یەدا ٢-٣ سەنگەری لێدابوو. ئاگاداری ئەوانیشمان کرد کە (٢٠٠) دوو سەد مەترێک لە رێگەکە دوورکەونەوە و چەند تەپۆڵکەیەک کە لە پشتیانەوە بوو سوودی لێ وەربگرن و سەنگەری لێ هەڵبکەنن.

لەوێوە بەرەو تەمووتە رۆیشتین. لە رێگە تووشی ئەمەر خانی شکاک هاتین کە (١٠٠) سەد سواری لەگەڵدا بوو، حەمە رەشید خان لە تەمووتە دەری کردبوو، هەر کە ئێمەی بینی لەگەڵمان گەڕایەوە. رۆژ درەنگی بەسەر داهات و گەیشتینە تەمووتە، حەمە رەشید خان لە ناو گوند بوو.

دوو کیلۆمەترێک دوور لە تەموتەوە لەبەرزایی چەند گردێک دوژمنی لێ بوو. دۆڵێک لە بنکەکەوە بەرەو خوار بە لای (تەموتە کۆندا) کە کەلاوەی تەمووتە بوو بەرەو جێگەی تەموتەی نوێ دادەکشا، کەلاوەکان نیزیکی (٥٠٠) مەترێک لە بنکەکەوە دوور بوون. لە دوو لای بنکە سەربازییەکەوە قوولله (بورج)ی لێ دروست کردبوو، لە هەر لای دوو قوولڵەکە کانیاوێک بە سەرووی تەمووتە بوو. ئەو بنکەیەش تەنێ هەر ئەو ئاوەی هەبوو کە پێویستی خۆیانی لە خواردنەوە و چێشت لێنان پێ جێ بەجێ بکەن. لە راستیدا جێگەی بنکەکە گەلێک ستراتیژی بوون بە هەر چوار لای خۆیدا زاڵ بوو، مەودای دیتنی هەبوو، گوندی تەمووتە لە ژێر لوولەی چەکی ئەو بنکەیەدا بوو، تفەنگی برنەویش لەوێوە دەگەیشتە نێو گوندی تەمووتە، کەچی حەمە رەشید خان لەوێ دانیشتبوو، دیار بوو گەلێک لە دوژمن دڵنیا بوو.

لەگەڵ مەلا مستەفا و حەمە رەشید خاندا لە یەکێک لە ژوورەکانی نهۆمی سەرەوەی جێگەی دانیشتنی خان، دانیشتبووین؛ پەنجەرەیەکی گەورەی مینا کە کەوتبووە بەرامبەر قولەکانی دوژمن تروسکەی دەدایەوە. بەر لەوەی کە مەلا مستەفا فەرمانەکەی حەزرەتی پێشەوا بە حەمە رەشید خان رابگەیەنێ، پێم ووت کە دانیشتن لەم جێگەیە و لەم خانووە گەلێک ترسناکە و مەودای نێوان ئێرە و قوولڵەکە زۆر کەمە و گوللەی دوژمن دەیگرێتەوە. بەڵام حەمە رەشید خان ئەمەی منی زۆر پێ ناخۆش بوو لەوەڵامدا ووتی: "هەرگیز گوللەی دوژمن ناگاتە ئێرە و ئێمە زۆر لە بنکەکەیانەوە دوورین و لەبەر چاوی تۆ وا هێندە نیزیک دیارە، خۆ ئەگەر نا چەند کاتە لێرەین و دوژمنیش هیچی پێ نەکراوە". پێم ووت: بێگومان راستە کە نەیان ویستووە گوللەبارانتان بکات... مەلا مستەفا نەیویست پتر لەو بارەوە بدوێین، فەرمووی با بزانین و فەرمانەکەی پێشەوای دایە دەست حەمە رەشید خان.

فەرمانەکەی پێشەوا، سەرەتا بە گلەیی لە حەمە رەشید خان دەستی

پێکردبوو پاشان فەرمووبووی کە "١٨٠٠ هێزی شکاکی جگە لە بارزانی لەگەڵتان دایە و ئەوا بۆ چەند مانگێک دەچێت نەتان توانیوە زیانێک بە بنکەی دوژمن بگەیەنن، بە لایەنی کەمەوە دەبا دەورتان بدابایەوو هەر لە دوورەوە رێگەتان نەدابا کە چەک و خواردەمەنییان بۆ بڕوات، وەک بیستوومانە مەڕ و مالات و ئازووقەیان بەئاسانی بۆ چووە و رێی لێ نەگیراوە...".

پاش خوێندنەوەی فەرمانەکە، مەلا مستەفا فەرمووی: "وا کاک بەکرم هێناوە کە هێزەکەی بهێنێت بۆ لابردنی ئەو پورگەیەی دوژمن". حەمە رەشید خان کە ئەمەی بیست رەنگی زەرد هەڵگەڕا و تەماشایەکی منی کرد و ووتی: "بانەییش لە بارزانییەکان نارەشید تر نین، هەموو ئازا و چالاکن. خۆشم بۆ ئەم کارە هاتوومەتە ئێرە و پەیمانتان دەدەمێ کە ئەو بنکەیەی دوژمن بگرم و پێویست ناکات کە بارزانییەکان بەو ئەرکە هەستن". مەلا مستەفا فەرمووی: "هەموومان سەربازی کوردستانین و هیچ جیاوازییەک لە نێوانماندا نییە. هەر کەس لە توانایدا بێت کارێک بۆ بەرژەوەندی کوردستان ئەنجام بدات ئێمە سوپاسی دەکەین. ئێستەش مادام جەنابت دەتەوێ ئەم کارە بەجێ بێنی، زۆر پیرۆزە و چی ترمان گەرەک نییە، بەڵام با هەرسێکمان پلانێک بۆ گرتنی ئەم بنکەیە دابنێین، ئەوجا رووی لەمن کرد و فەرمووی با بزانین بیرو ڕای تۆ سەبارەت بەم مەسەلەیە چۆنە"؟. لەوەڵامدا ووتم: هەروەک بەرێزتان دەبینن کە ئەو بنکەیەی دوژمن گەلێک زاڵە بەسەر دەوروبەرەکەی خۆیدا. تا مەودایەکی زۆر هەموو دەشتاییەو قوللەکانی لە گۆشەکانیدا دروست کراوە کە بە تۆپ نەبێت چارەی ناکرێ و ئێمەش تۆپمان نییە، بۆ ئابلۆقەدانیشی دەبێ لە دوورەوە بێت کە چەکی دوژمن نەمانگاتێ. جگە لەوە تا چەند هەفتەیەکیش رێگە نەدرێت کە خۆراک و پێویستییان بۆ بچێت. هێرش بردنە سەر بنکەکەش، من پێم وایە کە دەبێت هەر لە یەک لاوە بێت کە ئەویش رچگەی کەلاوەکانی تەمووتە سووتاوە، بەکورتی بیروڕای من بەم چەشنەیە:

١- له کـەلاوەکـانی تەمـووتە سـوتاوەوە هەندێک سـەرباز دابمەزرێنین، هەندێکیش بە دۆڵەکەدا هەڵکشێن و بە شەو خۆ لە کانیاوەکەی ئەو نێوچەیە نیزیک بکەنەوە.

٢- لە هەمان شەودا سەربازەکان خۆیان قایم بکەن، خۆ ئەگەر حەشارگە هەبوو خـۆیانی تێدا دابمەزرێنن، ئەگـەر نا بـە پەلە چەند سـەنگەرێک هەڵکەنن کە هەر یەکەی جێگەی یەک دوو سەربازی تێدا ببێتەوە.

٣- هەریەک لەسەربازەکان نانی سێ ڕۆژی خۆی پێ بێت.

٤- ئەم سـەربازانە و ئەوانی دیکەش کـە لە پشـتـیـانەوەن لە (تەمـووتە سـووتاو) بە هیچ جـۆرێک ڕێ بە دوژمن نەدەن بگەنە سـەر ئاوەکـە و سوودی لێ وەربگرن.

٥- ئەم شەڕەی ئێمە لەگەڵ لە شکری نیزامی میری دایە. لەوانەیە دوژمن هێرشی سەرئاوەکە بکەن و زیانێکی زۆر بە دەستەوە بدەن لە پێناویدا، لەبەر ئەوە پێویستە کە سەربازەکانی ئێمە لەو شەڕکەرانە بن کە لە باق و بریقی نێـزەی سـەر تفـەنگی دوژمن نەلەرزن و گـەلێک بە وورە و خۆڕاگر بن.

٦- لە هەر سێ لاوە هێزەکانی ئێمە لە دوورەوە خۆ پێشانی دوژمن بدەن تا دوژمن هەست بکات کە لە هەموو لایەکەوە هێرشی دەکرێتە سەر. بەم چەشنە سەرنجی دوژمن بۆ گشت لاکان ڕادەکێشرێ نەک بە تەنێ بەو لایەی ئێمەدا (تەمووتە سووتاو) کە هێرشی ڕاستەقینەی لێ دەکرێت.

٧- دەبێت بیـریش لەوە بکەینەوە کـە ڕەنگ بێت دوژمن بۆ پاڵپـشـتی و یارمەتیدانی ئەو بنکەیە هێزێکیان لە بانە یاخود لە سەقزەوە بە فریا بخـات. لە ڕێگەی سـەقـز بەتالیـۆنی (٢)ی بارزانی لێیە، بەڵام لە ڕێگەی بانە کـەسی لێ نییـە و دەبێت ژمارەیەک سەربازمان بۆ ئەو ڕێگەیە تەرخان بکرێت.

ئەوی پێوەندی بە بیرو ڕای منەوە بوو بەو چەشنە خستمە بەردەستیان و

داواشم لێ کــردن گــەر ئەوانیش بیـــرو ڕاو پلانێکی دیکەیان هەیە تا بفەرمـوون پێشکەشی بکەن. لە کۆتاییدا بە باشیان زانی بە گوێرەی ئەو پلانەی من دامنابوو هەڵوێست بنوێنن.

بڕیار درا کە حەمە رەشید خان هێرش بەرێتە سەر ئەو بنکەیەی دوژمن، مەلا مستەفا فەرمووی: "ئەمشەو ئێمە لێرەین، فەرموو جەنابی خان بنێرە بە شوێن چەکدارەکانتا و بچنە ئەو جێگەیەی کە بە پێی ئەم پلانە دیاری کراوە، بە تایبەتی خۆ نیزیک کردنەوە لەو کانیاوەی بنکەی دوژمن گەلێک گــرنگە و دەبێت ئەم کــارە ئەمــشــەو بە ئەنجــام بدرێت تا دوژمن فــریا نەکەوتووە و بیری لە قایم کردنی ئەو رێگەیە نەکردۆتەوە، دووریش نی‌یە کــە دوژمن لە هاتنی ئێــمــە بۆ ئێــرە ئاگــادار بکرێ و لە مــەبەســتی ئەم هاتنەشمان تێ بگات".

حەمـە رەشـیـد خـان ئێـمـەی جێ هێـشت و چووە ناو هێـزەکەی. ئێـوارە گـەڕایەوە لامـان و ئاگـاداری کـردین کـە هەمـوو شـتـێکی سـاز کـردووە و چەکدارەکـانیشی ئامـادە کردووە کە هەر ئەو شـەو بگەنە لای کـانیـاوەکە، لەوەشی ئاگـادار کـردین کە ژمـارەیەک سـەربازیشی ناردووەتە زورگەکـانی باکووری بنکەی دوژمن بۆ سەر رێگەی بانە – تەمووتە.

ئەو شەوەمان تەواو کرد و نەکرد، لە بەری بەیانیدا تەقە دەستی پێکرد. دوژمن گـولله بارانێکی وا خـەسـتی کـردین کـە بە پەلەو شـلـەژاوی‌یەوە لە گـوند چووینە دەرەوە. بە تـەواوی لە تەمــووتە دوور کــەتبــووینەوە کــەچی دیسان دوژمن هەراسانی کردبووین.

هەر لەو کاتەدا بە دەنگی بەرز هاوارم کرد:

جەنابی خان گوللەی دوژمن دەمانگاتێ یان نا؟... وەڵامی دامەوە ووتی: ئێـسـتـە کـاتی ئەوە نییـە، دەبینین ئێـمـە لە چ وەزعـێک داین؟... خـان بە شڵەژاوی‌یەوە لە ئێمە ون بوو هەر نەشمان زانی بەرەو کوێ چوو.

لەگەڵ هەڵاتنی رۆژ دا فڕۆکەیەکی دوژمن گەیشتە سەرمان و ئاگربارانی

کردین. لەو دەشت و دەرە بڵاو بووینەوە، شەش وڵاخی سواریشمان بەرەو رووکاری دوژمن هەڵاتن کە یەک لەوانە هی کاک عێزەت عەزیز بوو، جانتایەک لە خاولی و شتومەکی تەراش و کەلوپەلی لەسەر بوو.

دوایی بۆمان دەرکەوت کە جەماعەتی خان ئەو شەوە لە تەمووتە سووتاو بەو لاوە نەڕۆیشتوون، بەڵکو هەر کە تەقە دەستی پێکردووە، ئیدی بەرەو دوا کشاونەتەوە و (٧) شەهیدیان داوە لەگەڵ چەند برینداریک. ئێمەش بە پچڕپچڕی لە نێوچەی شەڕەکە دوور کەوتینەوە و بۆ ئێواری گەیشتینە گوندی "ئاخ کەند". دیاربوو کە ئەم گوندە ئاگاداری ئەو شکستییەی تەمووتە بوون. لێرەش جگە لە ئاغاو کوێخای گوندەکە کەسی تێدا نەمابوو. هەر چۆنێک بوو ئەو شەوەمان لەوێ بەسەر برد، بۆ بەیانییەکەی مەلا مستەفا گەڕایەوە بۆکان و لەوێوە بۆ مەهاباد، منیش بۆ بەتالیۆنەکەی خۆم لەسەرچاوە.

## شەڕی مامەشەی دووەم

لە تەمووتە بە هۆی بێ سەروپێیی حەمە رەشید خانەوە، دوژمن سەرکەوتنێکی گچکەی بە دەست هێنا ویستی تۆڵەی شکستی شەڕی پێشوویان بکەنەوە کە سەروان خوسرەوی و ژمارەیەک سەربازیان لێ کوژرا بوو، هەروەها ئەو زیانانەش کە لە شەڕی قاراوا لێی کەوتبوو.

رۆژی ١٩٤٦/٤/١٥ دوژمن هێرشی بردە سەر چیای "مەلقەرەنی" بۆ سەر بەتالیۆنی یەک ئەو پەیمانەی کە لە نێوان کۆماری مەهاباد و حکومەتی ئێراندا بەسترابوو (رێگەی هاتووچۆی نێوان بانە - سەقز، بانە - سەردەشت، کە لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا بوون لە حکومەتی ئێران نەگرین بەو ئومێدەی کە لە رێی وتووێژکردنەوە هەردوو لا لەسەر شتی دیکەش رێک بکەون) سەری نەگرت.

"رەزم ئارا" بە هێزی ئێرانی - لە شکری چواری کوردستان - فەرمانی دا، کە هەمایونی فەرماندەی ئەو هێزە بوو بە دوو هەنگ (لیوا) لە سەقزەوە هێرشیان بردە سەر گردی مامەشە لە چیای مەلقەرەنی. بەداخەوە هەر ئەو چەند بارزانی‌یەی کە لە پێشەوە باسمان کرد لەوێ بوون. کاتێک کە مەلا مستەفا لەوێوە تێپەڕ دەبێت و دەچێتە تەمووتە فەرمان بەمستەفا خۆشناو دەدات کە ژمارەیان زێدەتر بکات و سەنگەر لەسەر لووتکەی بەرزایی‌یەکان لێ بدەن، بەڵام مەخابن ئەو کارانە هیچی ئەنجام نەدران. دوژمن هێرشێکی گەلێک فراوانی دەست پێکرد، لە چەند کاتژمێرێکی یەکەم بە هەموو جۆرە چەکێک لەگەڵ تۆپ و فڕۆکە، گردی مامەشەی ئاگرباران کرد، پاشان بە زیل و تانک و پیادە هێرشی بردە سەر بارزانییەکان. شەڕێکی خوێناوی رووی دا، بارزانییەکان شێرانە دەستیان لێکردنەوە، منیش فەرمانم بەحەمەد میرخان دا کە لە لای ئاڵتوونی خوارەوە خۆی لە لاشانی دوژمن نزیک بکاتەوەو تەقەی لێ بکات تا دوژمن بەردەوام هێز و تینی بەرەو رووی مستەفا خۆشناو نەکات و بەو

چەشنە تا شـەو بەسـەردا دێت دوژمن خـەریک بکرێت، هەروەها پلانێکی دیکەشم بەدەسـتـەوە بوو، کـە لە خـوارەوە چۆک بەدوژمن دادەین و لەوەش زێتر بۆمان نەدەکرا بچینە پێشەوە، چونکە لە مـاوەی چەند سەعـاتێکدا دوژمن توانیـبـووی گـردی مـامـەشـە بگرێت. هەر لەسـەر مـامـەشـە چەند قـوللەیەکی دروست کرد و بە بەرزایی مـەترێکیش دیواری بەرز کـردەوە و تانکیـشیـان بردبووە سەری و تەواو خۆیان دامـەزراندبوو. کـاتژمێـر یەکی پاش نیوەڕۆ نامەیەکم لەمستەفا خۆشناوەوە بۆ هات، لەوێدا نوسیبـووی: (١٢) شەهیدمان هەیە. سەرپەل خۆشەوی خەلیل برینەکەی زۆر کوشندە بوو، بە پەلە نێردرا بۆ تەورێز، بەڵام بەداخـەوە گیـانی پاکی کـردە قـوربانی کـوردستـان، جگە لەوە کـاک مسـتـەفا نووسیـبـووی کـە هێرشی دوژمن زۆر بەتینە داوای یـارمەتی دانی لێکردبووین، لە وەڵامدا بۆم نووسیـبوو کە تا شەو خۆی ڕاگرێ و پشت بە خوا هێرشی دوژمن دەوەستێنم، دەست بەجێ پەلێکم بە سـەرکـردەیی حەمـەد ئەمین بۆ ئاڵتـوونی خـواروو کـە نیـزیکی مامەشەیە رەوانە کرد، پەلێکیش بە فەرماندەی مامەند مەسیح بۆ کانی نیاز کە نزیک مامەشەیە رەوانە کـرد تا دوژمن وا هەست بکات کـە ئێمە نیازی هێرش بردنە سەریانمان هەیە و لەو لاشەوە بەرەو پشت یان دەکەوێتە مەترسییەوە، لە هەمان کاتدا تاوە بارانێکی باش باری و وەهابی حەمەد علی ئاغا گەیشتە لام و نامەیەکی لە حەمە رەشید خانەوە بۆ هێنابووم، لە نامەکەیدا داوای لێ کردبووم هێرش بەرمە سەر گردی مامەشە و هەروەها کاک وەهاب ئاگاداری کردم کە حەمە رەشـید خان زۆر دۆستێـتی و رێزی لای هەیە. دوایی بە پێکەنینەوە بە کـاک وەهابم گـوت: ئایا تۆ دەزانی کـە داواکـەی خـان زۆر سـەیرە، یان زۆر نەزانە و هیچ لە شـەڕکـردن نازانێت یاخود مەبەستێکی گەلێک خراپی هەیە، چونکە لای ئێمەوە تا دەگەینە بن لووتی دوژمن دوو کیلۆمەتر زێتر دەبێت کە ئەویش دەشتێکی رووتەڵەیە و لە بن ئاگـری گـوللە تۆپ و چەکی دوژمندا دەبین. بە تایبـەتیش بەم رۆژە هێـرش هەر ناکرێت بۆیە من پێم وایە کـە خان دەیەوێ هەمـوو هێزەکـەمان

لەو نێوە بە کوشت بچێت، حەزیش دەکەم کە بگەڕێیتەوە لای خان و پێی بڵێی کە بەقسەی ئەو هێزەکەی خۆم لە نێو نابەم جگە لەوە من یارمەتی دانی کاکە مستەفا بە پێویستی سەر شانی خۆمی دەزانم، و بۆ خۆشم دەزانم کە بە چ هەڵدەستم.

نیزیک بوونەوەی هێزەکەی ئێمە لە سەقز، بووە هۆی هێورکردنەوەی هێرشی دوژمن و ئێوارەشی بەسەر داهات نەگەیشتە ئاڵتوونی ژووروو راوەستا، هەروەها کاک وەهابیشم راسپاردبوو کە کاک مستەفا خۆشناو ئاگادار بکات کە تا شەو دادێت خۆیان رابگرن. منیش کارێکی وا بە دوژمن دەکەم کە بەرەو دوا بکشێتەوە.

شەو بەسەر داهات ژمارەی (٥٠) بارزانیم لە نیزیکی کانی نیاز کۆ کردەوە، کە نیزیکترین گوند بوو لە سەقزەوە و پێم ووتن:

کێتان ئامادەیە کە ئەمشەو بە کارێکی کۆماندۆیی هەستێت، لە شەهید بوون نەترسێت، ئامادە بێت بچێتە نێو جەرگەی دوژمنەوە. ئەم کارەمان پێویستە تا براکانی بەتالیۆنی یەکمان لەو نارەحەتی‌یە رزگار بکەین، تا لووتی دوژمن بشکێنین و نەهێڵین چی دیکە شانازی بە خۆیانەوە بکەن. خۆ ئەگەر بێت و دوژمن لەو هێرشە سەربکەوێ، ئەوا جەبهەکە هەمووی دەکەوێتە مەترسی‌یەوە، بەتایبەتی بە تالیۆنی (٢)ی کاک میرحاج لە نێوچەکەی دادەپچڕێ و زیانێکی زۆر بە دەستەوە دەدات.

هەر هەموویان زۆر قارەمانانە وەڵامیان دایەوە کە ئامادەی ئەو کارەن، هەر هێندەم پێکرا کە پڕ بە دڵ سوپاسیان بکەم و پاشان (٢٥) کەسم لێ هەڵبژاردن و فەرماندەیی ئەو کارەشم دایە دەست حەمەد ئەمین میرخان. پلانی راپەڕینی ئەو کارەم بەو چەشنە بوو:

١- ئەو (٢٥) کەسە لە "کانی نیاز"ەوە برۆن بەرەو رووباری سەقز، رۆیشتنەکەیان بەناو رووبارەکەدا بێت تا دەگەنە نێو سەقز.

٢- ئەو (٢٥) کەسە لە نێو شار ببنە دوو کەرتەوە، کەرتێکیان خۆی

بگەیەنێتـە سەر رووباری نێو شار، ئەوی دیکەشیان خۆی بگەیەنێتە فرۆکەخانەی سەقز، لەوێ سریێکی فرۆکەی دوژمنی لێیە، (٧) زرێ پۆشیش (مدرعة) بۆ پاراستنی فرۆکەخانەکە لەگەڵ پاسەوانەکانیان دانراون.

٣- چەند نارنجـۆکێکم بە هەریەک لە بارزانییەکان دا، کە هەندێکیان سووتێنەر (حریق) بوون، جگە لەوە بەهەر کەرتێک رەشاشێکی برنەوی بچووک لەگەڵ ژمارەیەکی باش فیشەکی تانکبڕم دانێ.

٤- ئەو کەرتەی کە دەگاتە بن پردی سەقز تەقەیەکی زۆر لە نێو شاردا دەکەن، بەتایبەتی لە پۆلیسخانە و قوللەکانی دەوری شار بۆ ئەوەی دوژمن بشڵەژێت.

٥- ئەو کەرتەش کە دەچێتە سەر فرۆکەخانەکە گەر بتوانن خۆیان هێندە نیزک بکەنەوە کە بە گوللەی ئاگردار و تانکبڕ زیان بە فرۆکە و زرێ پۆشەکان بگەیەنن و بیانسووتێنن.

٦- تەقە لە شار و فرۆکەخانە بەردەوام دەبێت تا بەرەبەیان ئەو دەمە دەگەڕێنەوە گوندی کانی نیاز.

بەم چەشنە لە کاتی دیاریکراودا بارزانییەکان گەیشتنە ئەو جێگایانەی کە مەبەست بوون، تەقە لە ناو شار و فرۆکەخانەکە دەستی پێکردن لە کانی نیازەوە لێمان دیاربوو کە چۆن دوژمن بەهەموو لایەکدا تەقەی دەکرد، و گوللەی رووناکی دەهاویشت و شڵەژاوی پێوە دیار بوو. ئەو شەوە تاوە بارانێک باری. ئەو کەرتەمان کە بۆ سەر فرۆکەخانەکە هێرش برد بوو نەیتوانی بوو خۆیان زۆر نزیک بکەنەوە، هەر لەسەر کەنداوی سەقزەوە زرێ پۆشەکان لەگەڵیان بەشەڕهاتبوون، چەند گوللەیەک بەر یەک دوو زرێ پۆش کەوتبوو بەڵام فرۆکەکان زیانیان پێ نەگەیشتبوو. لە بەرەبەیاندا بارزانییە دلێرەکان گشتیان بە سەلامەتی گەڕانەوەکانی نیاز. پاشان لە نێو شارەوە هەواڵم بۆ هات کە (١٨) سەربازی دوژمن لەو شەڕەدا

کوژرابوون، بەڵام ژمارەی برینداره‌کانیان نەزاندرابوو.

ئەو هێرشەمان وای کرد لە دوژمن کە دەست لە هێرش بردنە سەر بەتالیۆنی (١) هەڵگرێ و بگەڕێتەوە سەر گردی مامەشە، لەوێ دەستیان کردبووە قولله دروست کردن و خۆ قایم کردنەوە. بەو جۆرە شەڕ لەسەر بەتالیۆنی یەک راوەستا.

(٢٠) رۆژێک بەسەر ئەو شەڕەدا تێپەڕی کرد ئەم گوندانەی کە بەتالیۆنەکەمی تێدا دامەزرابوو بەرامبەر بە دوژمن وەک: قاراوا، ئاڵتوونی خواروو، کونەکۆتر، کانی نیاز و دەوروبەرەکەی. هەروەها نزیک بە سەقزیش بەتالیۆنم گوێزابۆوە گوندی قاراوا. ئێرە زۆر دوور نی‌یە لەسەر رێگەی سەقز - سەرا - بۆکان، هەر لەسەر رێگە کەلاوە چایخانەیەکی لێ بوو، کەرتێک بارزانی کە پێک هاتبوو لە (٢٠) کەس لە ژێر فەرماندەیی سەعید حەمە عەلی ئاغا رەواندزیدا کردمن بە پۆست (سیطرە) بەمەبەستی پشکنینی هەر کەسێک گەر لە سەقزەوە بێت و بۆ سەرا - بۆکان یاخود گەر بەرەو سەقز بڕوات.

لەو کاتەدا هێشتا وتوویژ کردن لە نێوان کۆمار و تاراندا نەپچڕابوو. گوندی قاراوا سەر بە عەشیرەتی فەیزوڵڵابەگی بوو ( کە ئەمانەش لە عەشیرەت و خزمانی پێشەوا بوون. ئەم گوندە سەر بە دوو برا بوو کە لەو عەشیرەتە بوون. یەکێکیان عەبدوڵڵاخان و ئەوەی دیکەیان عەلی خان. عەبدوڵڵاخان لە گوندەکە مابۆوە، بەڵام عەلی خان لەوێ نەمابوو، رووی کردبووە گوندێکی دیکەیان). منیش بە دەرفەتم زانی و داوای خانووەکەی عەلی خانم کرد و کردمە بنکە.

رۆژێک ئاغایانی فەیزوڵڵا بەگی، ٢٠-٣٠ کەسیان لەماڵی عەبدوڵڵا خان میوان دەبن. زۆری پێ ناچێت نیشانە دادەنێن و بێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بکەن دەست بە تەقە کردن دەکەن. لە راستیدا بێ روخسەت وەرگرتن ئەو تەقە کردنەم بە راست نەزانی، چونکە سەربازەکانمان لە سەنگەری شەڕدا بوون و بەو کارە گەلێک دەشڵەژان. دەست بەجێ یەکێکم

نارده لایان که ئەو تەقەکردنە راگرن و لە ئەنجامەکەشی ئاگادارمان بکەن. وەڵامیان داینەوە کە لە خۆشی سەدری قازی‌یە (برای پێشەوا، نوێنەر دەبێت لە پەرلەمانی تاران دا) لە تارانەوە دەچێتەوە مەهاباد و ئەمانەش خزمی ئەون و هاتوون پێشوازی لێ بکەن و لەگەڵ خۆشیاندا چەند کاوڕێکیان ئامادە کردبوو کە لەبەر پێی بەڕێز سەدری قازی‌دا سەری ببڕن. منیش دەست بەجێ چەند بارزانی‌یەکم نارده لایان و چوونە دەرەوەیانم لەماڵی عەبدوڵلاخان قەدەغە کرد و لەوێ وەک بەند هێشتمنەوە. زۆری پێ نەچوو لە هەموو کەرتەکانی بەتالیۆنەکەمانەوە تەتەر هاتن بۆ زانینی هۆی ئەو تەقە کردنە.

کات (١٢)ی نیوەڕۆ دەبێت بەڕێز سەدری قازی بە پۆستەکەی ئێمەدا دەیەوێ تێپەڕێت. لەوێ رایدەگرن و ئۆتۆمبیلەکەی دەپشکنن، ئەویش هیچ دەنگ ناکات تا لێ دەبنەوە، ئەوسا پرسیاریان لێ دەکات؛ دەزانن من کێم؟ پێی دەڵێن کە ئەوان لە سنگەری شەڕدان و فەرمانیان پێ دراوە هەموو کەسێ بپشکنن. پاشان پێیان دەڵێت کە من سەدری قازی برای پێشەوام، ئەگەر بتان ناسیبام هەر دەتان پشکنیم؟:- بەڵێ. لەبەر ئەوە فەرمانمان پێ دراوە بۆ ئەم کارە کە هەموو کەس بە چاوێک تەماشاکەین. سەدری قازی بەرێکوپێکی ئەم کارەیان گەلێک خۆشحاڵ دەبێت، ئەوجا دەپرسێت؛ فەرماندەی ئێوە کێیە؟ وەڵام دەدەنەوە کە رەئیس بەکر عەبدولکەریمە و ئێستە (پەدپەڵکۆڤنیکە - مقدم)، و لەوێ نامەیەکی بۆ نووسیبووم و دایبوویە دەست سەربازەکان کە بیگەیێننە دەستم و بەوانیشی ووتبوو کە دەمەوێ فەرماندەکەتان ببینم، بەڵام لەبەر ئەوەی بە پەلەم تکایە ئەو نامەیەی لە بری چوونەکەی خۆم بگەیەننە دەست. دوای سڵاو پێشکەش کردن، لە نامەکەیدا نووسیبووی:

"چاوم بە سەربازەکانی کوردستان کەوت. لە خۆشی ئەو رێکوپێکی و کار بەرێوەبردنە نیزامی‌یە وەک تەمەنم بیست ساڵ گەنج تر بوو بێتەوە وایە. نازانم چۆن سوپاسی ئێوە و سەربازەکانت بکەم. زۆر بە پەلەم کە بگەمەوە

مـەهاباد، ئەگـینا دەهاتمە زیارەتتـان لە بۆکـان کـارم هەیە و کـەمـێک دەمێنمەوە، ماشێنەکەمت بە دوادا دەنێرم و خۆم بە بەختیار دەزانم تەشریف بفەرمووی تا چاوپێکەوتنێکت بۆ یادگار لەگەڵدا بکەم".

کـە گەیشـتـبـووە بـۆکـان، مـاشـینەکـەی بە دوادا ناردم. منیش بـۆ دیدەنی چوومە ئەوێ. کاک محەمەد ئەردەڵان لێپرسراوی رۆژنامەی "کوهستان"یش لەگــەڵ بەڕێز ســەدری قــازیدا بوو. پاش چاوپێکەوتن لە تەنیــشـت مـاشـینەکـەوە وێنەیەکی یادگـاریمان پێکەوە گـرت و ئەوان بەرەو مـەهاباد کـەوتنەرێ و منیش بەرەو قاراوا گـەڕامەوە. ئاغـایانی فـەیزوڵڵا بەگی کـە لەسەر تەقەکردنەکە رۆژێک تا ئێـوارێ بەندم کردبوون، لای وەزیری جەنگ مـحـەمـەد حـوسـێن خـان شکاتیـان لێکردبووم، رۆژێک نـامـەیەکم لەبەرێز وەزیرەوە بۆ هات، کـەلەوێدا فـەرمـووبووی: "خـزمـانی ئێـمـە ئاغـایانی فـەیزوڵڵابەگی هەمـوویان خاوەنی بیـروڕای پاکن، لە رۆحی کـوردایەتی بێ بەری نین، گلەییـیـان لێت هەیە و زۆر سـەغـڵـەتیـان دەکەی، لەبەر ئەوە بە مەسڵەحەت دەزانم کە بەتالیۆنەکەت لەو نێوچەیەی ئەوان بگوێزیتەوە".

ئیمزا: محەمەد حوسێن خان

وەزیری جەنگ

منیش وەڵامەکەییم بەم جۆرە دایەوە:

"وەزیری جـەنگی کـۆمـاری کـوردسـتـان، نامـەی ژمـارە... رۆژی... بە دەست گەیشت.

یەکـەم: سـەبارەت بە ئاغـایانی خـزمـتـان کـە گلەییـیـان لێم هەیە و گـوایە من سـەغـڵـەتیـان دەکـەم، فـەرمـانێکی راسـتـەوخـۆ و دەست و بردانەتان دەرکـردووە، کە بەتالیـۆنەکەم لەبەر خاتری ئەو خزمـانە لە نێـوچەکـەیان بگوێزمەوە، بێ ئەوەی هیچ لەمەسەلەکە بکۆڵنەوە کە بۆچی و لەسەر چی ئەو کارەم کردووە.

دووەم: "فەرمـووتانە کە ئەوانە خاوەن بیروباوەڕن و هەموو پاکن" ئێـمە گلەییـمان لەوە نی‌یە و نـکوڵی ناکـەین کە پیـاوی نیـشـتـمـان پەروەری وەک عـەلی

بەگی "یەک شەوە"مان هەیە، بەڵام پیاوی وەک حەسەن خانی نیازیش هەیە کە لە هەمان خزمانە، و بەکرێگیراوە و لە دەزگای جاسوسی دوژمندا کار دەکات. بەڵێ چەم بێ چەقەڵ نابێت. زۆر خۆشە کە هەموو خزمان شانازی بە حەزرەتی فەرماندە، پێشەوای بەڕێزەوە بکەن و چاو لەو لە خۆبوردنەی ئەو بکەن.

ئێمە لە سەنگەری شەڕ داین. هەندێک لە خزمانی فەیزوڵڵابەگی بۆ پێشوازی بەڕێز سەدری قازی هاتبوون و دەستیان بە تەق و تۆق کردووە. هێندەی نەمابوو لەو کارەی ئەوان هەموو جەبهەکەمان بشلەژێت و تێک بترازێ. جا بەگوێرەی فەرمایشتەکەتان دەبێت ئەرک و قورسایی لە شکری کوردستان بە تەنێ لەسەر ئەو دێهاتانە بێت کە پێوەندی خزمایەتییان بە جەنابتانەوە نی‌یە.

ئەو جێیانەی کە من بەتالیۆنم لێ داناوە، لە سەنگەری دژ بە دوژمن دان و گەلێک پێویستن، هەر جێیەکیش ستراتیژی بێت لەوێیان دادەنێم جا پێوەندیم بەوەوە نی‌یە ئەو جێگەیە سەر بە چ کەسێکە، گرنگ ئەوەیە کە گیانی سەربازەکانمی تێدا بپارێزم و زیانێکی کوشندەش بە دوژمن بگەیەنین، بۆیە دەبێت ببوورن کە بەتالیۆنەکەم لەو جێگەیە لا نابەم، چونکە بە لادانیان ئەوە لاشانی هەموو بەتالیۆنەکانی تر چۆڵ دەبێت و تا بۆکانیش مەترسی دەکەوێتە سەر. بۆیە بەرژەوەندی جەبهەکە وا دەخوازێ کە ئەم بەتالیۆنە لە جێگەی خۆی بمێنێتەوە".

وێنەیەک لەم نامەیە بۆ پێشەوای بەڕێز

ئیمزا
پەدپەڵکۆڤنیک
بەکر عەبدولکەریم
فەرماندەی بەتالیۆنی -٣-

ئیدی وەزیری جەنگ چی دیکە لەو بارەیەوە نەیپرسیەوە.

## نامەی حەمە رەشیدخان و سەر لەشکر هومایۆنی

ئەو پۆستە (سەیتەرە)یەی کە لەوەوبەر باسمان کرد لە نێوان رێگەی سەرا – سەقز بۆ پشکنینی خەڵکی دانرابوو، رۆژێ ماشێنێک لە سەقزەوە بەرەو سەرا دەیەوێ برِوات. لە کاتی پشکنیندا لە گیرفانی یەکێکیاندا نامەیەک دەدۆزنەوە کە لە سەر لەشکر هومایۆنییەوە بۆ حەمە رەشید خان نووسرابوو، هەروەها هەندێک کەل و پەل و شەکر و چاشی بە دیاری پێ دەبێت بۆ نێو براو، کابرایان هێنایە لام بۆ قاراوا. هەر چەندە نامەکە بە ئاسایی نووسرابوو، بەڵام بە ئاشکرا تێبینی ئەوە دەکرا کە نهێنییەک لە نێوان هەردووکیاندا هەبوو هەمایۆنی ئومێدی سەرکەوتنی بۆ خان دەکرد. وێنەیەکی نامەکەم نووسییەوە و پاشان نامە و شت و مەکەکانم دایەوە دەست کابرا کە بیگەیەنێتە دەست حەمە رەشید خان کۆپی ئەو نامەیەشم ناردە خزمەت حەزرەتی پێشەوا بۆ مەهاباد. سەرکردەی پۆستەکە کە سەعید ئاغا بوو بە نهێنی تێم گەیاند کە لەوەڵامی نامەکەی بۆ هەمایۆنی گەلێک وریا بێت و جا چ ژن بێت و چ پیاو بە ووردی بپشکنرێ و وەڵامەکە بگیرێت.

ماوەی دە رۆژێک تێپەری کردبوو، رۆژێک دوای نیوەرۆ لە پۆستەکەوە کابرایەکی پیری سەر سپی، پشتێن سەوزی باڵابەرزیان هێنایە بنکەی قاراوا (شێخ مەلا حوسێنی ناو بوو). گەلێکی هەوڵ دابوو کە رێگەی بدەن بچێتە زیارەتی گۆری مەزارگەی شێخ "دۆزەخ دەرە" کە کەوتبووە خوارووی سەقزەوە، بەڵام وازیان لێ نەهێنابوو و زۆر بە ووردی پشکنی بوویان و شانەیەک بە سەر و رێش و مووەکانی بن باخەڵیدا دێنن و هەر لە بن باخەڵیدا نامەیەکی لوولدراو وەک کاغەزە جگەرە دەدۆزنەوە، کاتێک کە کردمەوە، دیتم وەڵامی حەمە رەشید خانە بۆ هومایۆنی. گەلێک بە سەر و پۆتەڵاکی شێخ مەلا حوسێندا هاتمە خوارێ و پێم ووت: ئەرێ مەلا، تۆ لە لایەک بە بەرگی مەلایەتی و لە لایەکی دیکەش بە پشتێنی سەوزی

شێخایەتی و بەو تەمەنی پیرایەتی‌یە چ بەزمێکت لە جاسوسی داوە. ئایا تۆ هێندە تەمەنت لە ژیاندا ماوە، دڵ بە چ پاشەرۆژێکت خۆش دەکەی کە خیانەت و خۆ فرۆشی لەمیللەتەکەی خۆت دەکەی؟ مەلا دەبێت نموونەی نیشتمان پەروەری بێت، پێم وایە خوێندووتەوە کە "حب الوطن من الایمان"ە (ئەوی نیشتمانی خۆی خۆش نەوێ ئەوا ئیمانی نی‌یە). ئایا کوردستان نیشتمانی تۆ نی‌یە؟ ئەگەر وایە ئەی بۆچی و بۆماڵی دونیایە خیانەتی لێ دەکەیت. دیارە بەکرێ گیراویت، ئیدی چی دیکەت لەوە زێتر پێ ناڵێم. پاشان مەلا سوێندی خوارد کە جارێکی دیکە، ببڕای ببڕای ڕێگەی خراپەکاری و سیخورایەتی نەگرێت. نامەکەشم ناردە خزمەت حەزرەتی پێشەوا، پاش ئەوەی کە وێنەیەکم بۆ خۆم لەسەر گرتەوە.

هەر لە رۆژانی کۆماری مەهابادەوە تا کۆتایی پێی هاتنی، کە بە داخەوە دەڵێم، چ ئەو نامانە و چ گەلێک نامەی دیکەی ترو دۆکۆمێنتی (وثائق) زۆرم لا بوون کەلە "مەرگەوەڕ" لە ماڵی "سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی نەهری" لەگەڵ هەموو ناوماڵەکەمدا جێم هێشتبوون و لەبەر زرووفی نالەباری خۆم و هەڵاتنم هەر رۆژە بە لایەکدا، گشتی فەوتان و بە دەستم نەکەوتەوە.

دەست بەجێ پاش ئەو نامە گرتنە هێزێکم نارد و لە دوورەوە ئابلۆقەی گوندی سەرایان دا بۆ ئەوەی خان هیچ دەرفەتێکی چوونە دەرەوەی نەبێت تا فەرمانێک لە کۆماری مەهابادەوە دێت.

پاش ئەوەی کە حەزرەتی پێشەوا نامەکەی بە دەست دەگات. بە بروسکەیەک حەمە رەشید خان لە فەرماندەیەتی دەخات. دوا بە دوای ئەوە حەمە رەشید خانیش نامەیەک بۆ پێشەوا دەنووسێ کە لەوێدا بەرگری لە خۆی و لە رابردووی دەکات و من تاوانبار دەکات کە گوایا ناکۆکیم لەگەڵیدا هەیە و پیلانم بۆ داناوە. هەر لەو نامەیەدا دەڵێت: بە نامەی رەئیس بەکرێکی نەناسراو، منت شکاندەوە و لە فەرماندەییت خستووم. بەڵام من کابرایەکی نیشتمان پەروەرم.. هتد. بەڵام نامەکەی لای پێشەوا پوچەڵ کرابۆوە. پاش سێ رۆژێک لە ناکاو مەلا مستەفا گەیشتە قاراوا.

بەدرێژی مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەویش فەرمووی: "حەمە رەشید خان مەسەلەکەی وا بۆ پێشەوا هۆنیوەتەوە کە گوایا ئەوە پیلانێکە و تۆ داتناوە و لەبەر خاتری من بووە، تا ئەو لەم مەیدانەدا هیچ دەسەڵاتێکی نەمێنێ و من جێگەی هەموو دەسەڵاتێکی ئەو بگرمەوە".

لەوەڵامدا بەڕێز مەلا مستەفام ئاگادار کرد کە ئێمە لە کوردستانی عێراقەوە لەگەڵ هێزی بارزانی‌یەکاندا هاتووین. خۆشمان بە سەربازی بە رۆحیەت و خەباتگێڕ دەزانین و لە سەنگەری دژ بە دوژمن داین لە پێناوی مافی کورد دا. لەوانەیە لەم رێگە پیرۆزەدا شەرەفی شەهید بوونیشمان پێ ببڕێت و بۆ هیچ مەبەست و بەرژەوەندی‌یەکی تایبەتی خۆمان نەهاتووین، جگە لەوەی کە پاراستنی کۆمارەکەمان لە پیلان و دەست درێژی کردنی دوژمن لە هەموو شتێکی دیکە لا گرنگترە. هەروەها زۆر نامەردی‌یە بۆ کەسێک کە خۆی بە دڵسۆز و کورد پەروەر بزانێ بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆی یان تێخوێندنەوەی خزمایەتی یاخود برادەرایەتی و خۆشەویستی یەکێک هەستێت بە تاوانبارکردنی مرۆڤێکی پاک و کوردێکی خاوێن یاخود پلانی بۆ دروست بکات و پاشەڵ پیسی بکات. ئەمە خوو و رەوشتی کەسێکی پاک نی‌یە، لەبەر ئەوە من خۆم گەلێک لەوە بە بەرزتر دەزانم و لە بنەماڵەیەکی واش نیم کە ئەو جۆرە رێگەیە بگرمە بەر. بە دڵنیاییشەوە دەڵێم گەر گومانم لە خۆفرۆشی و نادڵسۆزی هەر کەسێک هەبێ ئەوا بە گوێرەی توانا و دەسەڵاتم رێی لێ دەگرم. ئەی گوایا ئێمە سەربازی کوردستان نین؟ تۆ بڵێی شەڕ کردنەوەمان لە سەنگەری دژ بە دوژمندا سەیران و رابواردن بێت؟ گەلێک شادمانم کە هەر کوردێک ببینم جگەر سۆزی نەتەوەکەی بێت.

بەڵام مەخابن لەو رۆژەی کە حەمە رەشید خان بووەتە فەرماندە و هێزی بارزانی‌یەکانی خراوەتە بن دەست هیچ کارێکی ئەوتۆی نەکردووە کە بەرژەوەندێتی تێدا بوویێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە کە دژی ئەو بەرژەوەندی‌یە بووە و هەموو شت لە پێناوی سوودی تایبەتی خۆیدا بووە.

دەسا پێوەندی کردنی خان لەگەڵ هومایۆنیدا بە چ دەقەبلێندرێ، ئەمە لە کاتێکیشدا کە لە گردی مامەشە ژمارەیەک لە جوامێرانی قارەمانی کوردی بە شەهید کردن دا جگە لە ژمارەیەکی زۆر لە بریندار. ئێمە پێمان خۆش بوو کە حەمە رەشید خان سەرکردەیەکی دڵسۆزی وا بایە کە سەری هەمووماانی بڵند بکردبایە و ببوایە بە نموونەیەک بۆ گشت سەرەک هۆزەکانی کورد، بەڵام مەخابن کە وا دەرنەچوو.

ئەوجا مەلا مستەفا ئاگاداری کردم کە دەیەوێ بچێتە سەرا بۆ دیدەنی حەمە رەشید خان. بەڵام من ئەو چوونەیەم بە باش نەزانی، چونکە مەترسیم هەبوو کە خیانەت لەمەلا مستەفا بکات. بەڵام وەک پێی ووتم کە چوونی بۆ ئەوێ بەرژەوەندی تێدایە. بەر لەوەی بچێت نامەیەکی بۆ حەمە رەشید خان نووسی، لە وەڵامدا خان نووسیبووی" : خۆشحاڵم بەهاتنەکەت، بەڵام تکایە رەئیس بەکر لەگەڵ خۆت نەهێنی، چونکە ناهەقی لەگەڵمدا کردووە و دوژمنمە و نامەوێ چاوم پێی بکەوێ".

ئەو رۆژە مەلا مستەفا بە خۆی و سێ چەکدارەوە چووە سەرا. شەو کە گەڕایەوە لەگەڵ یەک دانیشتین و فەرمووی: " ئەو کابرایە رووخاوە، ئەڕواتەوە عێراق رێگای بۆ چۆڵ بکە، نامەوێ کوشتاری لێ بکرێ، هەر چەندە کە دەزانم تاوانەکە گەورە و ئاشکرایە"، پێم ووت: "گومانم لەوەدا نی‌یە خۆ ئەگەنا بۆچی بەرەو عێراق هەڵدێت، با لەمەهاباد بمێنێ و بێ تاوانی خۆی بسەلمێنێ. جا من بە پێویستی دەزانم کە ئەو کابرایە بدرێتە دادگا و سزای خیانەتکاری‌یەکەی وەربگرێت و تاوانەکانیشی بۆ هەموو کەس ئاشکرا بێت". بەڵام مەلا مستەفا رێگەی نەدام. ناچار بووم کە رێگەی چونە دەرەوەی لە سەرا بۆ چۆڵ بکەم و ئەویش بەرەو عێراق رۆیشت.

## دروست بوونی تیپێک له کۆماری کوردستاندا

دوای ڕۆیشتنی حەمە ڕەشید خان، فەرمانێک دەرچوو کە مستەفا خۆشناو ببێتە جێ نشینی. له هەمان کاتیشدا، فەرمانێکی دی دەرچوو کە تیپێک (فرقەیەک) بە نێوی جەبهەی سەردەشت - بانە، پێک بێت، چونکە ئەو نێوچانە گەلێک ئالۆزی تێکەوتبوو و هەرچی دێهاتی گەورە بوو لە لایەن عەشیرەتەکانی بانەوە سووتێندرابوون، تەنانەت کاک عەولاخان و عەشیرەتەکەی ئاوارە بوون و گشتییان لە نێوچەی ڕەبەت گیرسابوونەوە. بۆ فەرماندەیەتی ئەو تیپە من هەڵبژێردرام. بەڵام بەر لەوەی فەرمانەکەم بە ڕەسمی بە دەست بگات مۆڵەتی پشوودانم وەرگرتبوو کە بچمە مەهاباد.

له قاراوا دەرچووم و گەیشتمە بۆکان. لەوێ بەرێز شێخ ئەحمەد بارزانیم بینی و کاک عیزەت عەبدولعەزیزیشی لەگەڵدابوو. بارزانی‌یەکی زۆریش جەبهەی سەقزیان بەجێ هێشتبوو، و هاتبوونە ئێرە زۆربەیان سەر بە بەتالیۆنی (٣)ی من بوون، جەنابی شێخ ئەحمەد کە چاوی پێم کەوت، فەرمووی: بۆ کوێ دەچیت، ئەو هەموو بارزانی‌یە بۆ هاتووەتە ئێرە؟ پێم ووت، منیش سەرم سوڕماوە کە بۆچی جێگەی خۆیان بەجێ هێشتووە، ڕەنگ بێت بۆ زیارەتی جەنابتان هاتبن. منیش مۆڵەتم هەیە کە بۆ ڕۆژێک بچمە مەهاباد و لەو کاتەوە کە لە جەبهەی شەڕ داین پشووم نەداوە، پێم وایە کە یەک لەو ئەفسەرانەی هەر لەمەهاباد دانیشتوون ماوەیەک بچنە جەبهە.

لێرەدا کاک عیزەت بە وەڵام هات، ووتی: "نەخێر، بیستوومانە کە لە مەلا مستەفا زوویر بوویت بۆیە دەچیتە مەهاباد. ئەو بارزانی‌یانەش بەر لەوەی کە جەنابی شێخ ئەحمەد بێت هەر وایان زانیوە بۆیە جەبهەیان بەجێ هێشتووە... حەزرەتی پێشەوا داوای لە جەنابی شێخ کردووە کە بێت تا نەهێڵێ ئەو جەبهەیە بەجێ بهێڵن، چونکە هیچ هێزێکی دیکە نی‌یە کە

ئێــرە بپــارێزێت و پێــشی دوژمن چۆڵ دەبێت". ئەوجــا جــەنابی شــێخ ئەحمەدیش فەرمووی: "من پێم باشە کە مستەفا خۆشناو لە جێیەکی دیکە دەست بە کار بێت (دواتر بووە بەڕێوەبەری پۆلیسی مەهاباد) ئێستەش لە زمــانی منەوە بە بارزانی بڵێ کــە پێــویســـتــە هەر هەمــوویــان بگەڕێنەوە جێگەی خۆیان".

لەوەڵامدا پێم ووتن: کاک عێزەت، هیچ کاتێک ئەوە لە من روو نادات کــە دڵم لەمــەلا مــســتــەفــا برەنجــێ، چونکە ئەو زیاد لە پێــویست ڕێزم لێ دەگــرێت، و گــشت ئەفــســەرەکــانیش لای مــەلا مــســتــەفــا ڕێزیان هەیە، بەتایبــەتی من کــە خــۆم وەک عــوبەیدوڵڵا داناوە. جا ئەو هەواڵەی کــە تۆ بیستووتە و لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت ڕاست نییە.

پاشــان لە جەنابی شــێخ ئەحــمــەدم پرسی کــە بۆچی لەمــســتــەفــا خــۆشناو زوویرن، بە تــایبــەتی کــە ئەویش لــە دڵســۆزیدا وەک هەر یەکــێــک لە ئێــمــە وایە و خەباتێکی زۆری کردووە و قوربانی بە خۆی دەدات، فەرمووی: چما نازانی کە شتێکی لەسەر بارزانییەکان نووسیوە؟.

پێم ووت کە هیچ شتێک ئاگادار نیم و لە ڕاستیشدا نەمدەزانی کە چی نووسیوە. فــەرمووی: "نوسیوێتی کــە بارزانییەکان شەڕ ناکەن، بە کــەڵکی هیچ نایــەن، جێگــەی متــمــانە نین، پێــویستــە هێــزێکی دیکــەی نا بــارزانی (بارزانی نەبێت) بێتە جەبهە و ئەوانە بگەڕێنەوە نێو عەشیرەتەکەی خۆیان و بە کەڵکی سەربازی نایەن".

ڕاستییەکەی سەرم سووڕما، چونکە هەمــووی یەک هەفــتە دەبوو کــە لێ پرســراوێتــی ئــەو جــەبهــەیــەی وەرگــرتبــوو، ئــەوجــا تێناگــەم کــە بۆچی ئەوە هەڵوێستی بوو. بەڵام من گــەلێک هەوڵم دا کــە قــەناعەت بە جەنابی شــێخ بکەم کــە ڕەنگ بێت ناحــەزێک ئەو قــســانەی هەڵبــەســتبــێت و مــســتــەفــا خــۆشناو شــتــی وای نەوتبێ، بەڵام ئەو بڕوای تــەواوی وا بوو کــە مــســتــەفــا خــۆشناو ئەو قــســانەی کــردووە و لەبەر ئەوە نەیدەویست کــە ئەو ببــێــتــە فــەرمــانــدەی بارزانییەکــان و فــەرمــووی کــە دەبێت مــن بچــمــە جــێگــەکــەی

مستەفا خۆشناو. پێم ووت جەنابی شێخ پێویستە، بەر لە هەمو شتێک بارزانی‌یەکان بگەڕێنەوە جێگەی خۆیان و منیش جارێ دەچمە مەهاباد و پێویستم بە پشوودان هەیە. لە ڕێگەی بەرەو مەهاباد، وا ڕێککەوت کە شێخ محەمەد خالیدی شێخ ئەحمەد و شێخ جەمالی شێخ ئەحمەد بۆ ئەوێ دەچوون.

ڕۆژی دوای ئەوەی کە گەیشتمە مەهاباد چوومە سەردانی حەزرەتی پێشەوا کە لەوێ کۆمەڵێک لەسەرۆک عەشیرەتەکانی لە خزمەتدا بوو. کە چاوی پێم کەوت فەرمووی: "بۆچی وا درەنگ هاتی، ئەوا چەند ڕۆژێک دەبێت کە ناردوومە بە شوێنتا و چاوەڕێت دەکەم". پێم ووت کە هیچ فەرمانێکی بەو جۆرەم بۆ نەهاتووە، ئێستەش کە لێرەم بە هۆی پشوودانی خۆمەوە هاتووم. ئەوجا فەرمووی: "هەر چەندە ئەوڕۆ فریا ناکەوی، بەڵام هەر لە ئێستە بە دوواوە هەرچی سەربازێکی بارزانیت لە نێو مەهاباددا، دی و دەستت دەکەون کۆیان بکەرەوە و سبەینێ دەچیت بۆ ڕەبەت.

هەرچی ئازووقە و پێویستی‌یەک هەبێت بۆت دەنێرین چونکە نێوچەی گەورک زۆر شڵەژاوە و عەشیرەتەکانی بانە لایەنگری حکومەتی تاران دەکەن. جا لەو نێوچەیە جگە لە حەمەد مەولود و (٢٨) کەس زێتر هێزی دیکەمانی لێ نی‌یە،. ئەو عەشیرەتانەش ئەمەیان بە هەل زانیوە و هێرشیان بردووەتە سەر نێوچەکە. لەبەر ئەوە عەشیرەتی گەورک نەیانتوانیوە بەرەنگاریان ببنەوە و هەڵاتوون و خۆیان گەیاندووەتە ڕەبەت و زۆربەی دێهاتەکانیشیان سووتێندراوە. بۆیە دەمەوێ کە بە زووترین کات بگەیتە ئەوێ و هێندەی پێت دەکرێ بارزانیش کۆ بکەرەوە. دەسەڵاتیشت دەدەمێ کە تیپێک لەوان و لە عەشیرەتەکان و دانیشتووانی نێوچەکە و خەڵکی دیکە پێک بێنە و چەکداریان بکە و بە هەر یەکەیشیان مانگانە (١٢٠) تمەنیان دەدرێتێ، لەگەڵ ئازووقەی پێویستی خۆیان و ماڵ و منداڵیان". پاش ئەوەی لە خزمەت پێشەوا هاتمە دەرێ لە نێو بازێڕی مەهاباد ژمارەی (٤٥) بارزانی کە مۆڵەتی پشوودانم دابوونێ، کۆم

کـردنەوە و. ئاگـادارم کـردن کـە بۆ ڕۆژی دواتر ئامـادە بن و بەرەو ڕەبەت دەچین. بە گوێرەی پێویسـتیش چەند ماشینێک بۆ گواستنەوەمان تەرخان کرا. دوایی چوومە دیدەنی مەلا مستەفا و مەسەلەی ڕۆیشتنەکەم بۆ باس کـرد. فـەرمـووی کـە سـاڵەح عـەبدولعـەزیز ئاغـای برای کـاک عـێـزەت عەبدولعەزیز لەگەڵ خۆم ببەم بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو بارزانی‌یانەی کە پاسەوانیم دەکەن. پاش هەفتەیەک چەند بارزانی‌یەکی دیکەشی ناردە لام و ئەو دەمە ژمارەی هەموویان گەیشتە (٧٠) سەرباز.

لە ڕۆیشـتنەکـەماندا ڕۆژی یەکەم لە دۆڵـی زەمزیران – گـوندی گـوێچکە دەرێ – ماینەوە و ڕۆژی دوواتر چووین بۆ ڕەبەت.

ڕەبەت کەوتووەتە دەشتـاییەک و گردۆڵکەیەکی بە تەنیشـتەوەیە لەسەر گردەکە چەند کۆنە سەنگەر و بنکەی ئێرانی‌یەکانی پێوە بوو کە بەجێیان هێشتبوو. بە گەیشتنمان بۆ ڕەبەت بنکەی تیپەکەم لەوێ دانا.

پاش مـاوەیەکی کەم، ئاغـایانی گـەورک: کاک ئەڵڵا ئاغـا (سەرۆکـیان بوو)، ئیبـراهیم ئاغـای سەرچاوە، مامـەند ئاغا و کەریم ئاغا و ئیـبراهیم ئاغـا بریسـوێ، لەو لاشـەوە لەبەری سـوێسنیـان: حـەمـەدی قـادر ئاغـا (سـەرۆکی مـەڵکەری‌یان بوو)، ئیبـراهیم ئاغـا (سـەرۆکی بەریاجـیـان) هەموو ئەمانە بە خۆیان و عەشیرەتەکەیان و چەندین کوێخا و دانیشتووانی سـوێسنیـان و دەوروبەری سەردەشت و مـەنگوڕایەتی هاتنە ڕیزی سـوپای کوردسـتانەوە. لە مـاوەی مانگێکدا ژمـارەی تیپـەکە گەیشـتە (٤٥٠٠) سەرباز، سنووری دەسەڵاتی ئەم تیپە لە سوێسنایەتی تا سنووری عێراق و لە لایەکی دیشـەوە تا شندرە و شـەمـۆڵەی نزیک بە شـاری بانە ڕۆیشت ئەوی کـە تەنیـا بنکەی دوژمنی لێ مـابۆوە شـاری سـەردەشت و گـوندی کـولـتی، لەگـەڵ بریسـوێ، لەسەر ئەو پردەی سەر ڕووباری کـەڵۆی نێـوان سەردەشت و بانە.

(١٨٠) سـەربازی نیـزامیش بە سـەرکـردایەتی سـەعـید زادە کـە پلەی کـەپیـتـانی پێ درابوو و سەر بە جـەبهـەی سـەردەشت و بانە بوون، هاتنە

ڕەبەت. منیش ئەمانەم لە گوندی مەلا شێخ، قەڵای وارش، شینوێ، بێوران، و قەلاوێ لەبەری سوێسنایەتی لە دەوری سەردەشت دامەزراند هەر لە گوندی تۆپزاوای نزیک مەهابادەوەو بە درێژایی دۆڵی زمزیران – مەنگوڕایەتی تا دەگاتە (همران)ی نیزیک بە ڕەبەت چەند پۆستێکم لەو شوێنانەی کە پێویست بوون بۆ پاراستنی ڕێگەی هاتوچۆمان لە نێوان مەهاباد ڕەبەت دامەزراند ژمارەی شەش لۆری و جیێبێکی ئەمریکیش بۆ کاروباری تیپەکەمان تەرخان کرا. بەرامبەری ئێمە تیپێکی دوژمن لە سەردەشت – بانە هەبوو کە سەرلەشکر (ئایروم) فەرماندەیی دەکرد. ئەم تیپە لە سەردەشت سربێن: (٧) فرۆکە و (٦) زرێ پۆش (مدرع)ی لەگەڵ بوو. سەرهەنگ پزیشکیان نێوێک فەرماندار (قائم مقام)ی سەردەشت بوو. ئەم کابرایە گەلێک کەڵەک چیو زمان لووس بوو، تەواو شارەزای عەقڵییەت و بیر و بۆچوونی خەڵکی ناوچەکە بوو. بەپڕوپاڵانتەو فرتو فێڵ خەڵکە سافیلکەکەی شار و دەور و پشتی وا تێگەیاندبوو کە کۆماری مەهاباد کۆمارێکی کۆمۆنیستانەی خودێ نەناسە و دەسەڵاتی بگاتە هەر جێگەیەک ئەوا بە توورەکەی دەبێژێ و خەڵکەکەشی قڕ دەکات، جگە لەوەی کە دەسەڵاتدارانی مەهاباد لەگەڵ رووسەکان بوونەتە یەک دەست و یەک هێز تا جەماوەری کورد لە ئاینی ئیسلام وەربگێڕن و لەم رووەشەوە دژ بە هەموو ئاینێکی ئاسمانی‌یە. بۆیە کەسێکی کە هاریکاری و پشتگیری لەو کۆمارە بکات کافر دەبێت.

هەڵبەتە بەردەوام داگیرکەرانی کوردستان مەسەلەی ئایین و ئاینزانی‌یەتیان کردووەتە چەکێکی خۆرت دژ بە کورد و خواستەکانی و هەمیشە کۆمەڵگای کوردەوارییان بەو چەکە تۆقاندووە و سەرپاکی بزووتنەوەی نیشتمانی و ئازادی خوازەکانی کوردیان بە چەتە و ڕێگر پێشان داوە و سەدان پڕوپاڵانتەی هەرزانیشیان بۆ هەڵبەستووە کە گوایا ئەو بزووتنەوانە دژ بە دەسەڵاتی پاکی ئیسلامە، نەک هەر ئەوە بەڵکو وێرانکردنی کوردستان و کوشتنی گچکە و گەورەی کوردیان بە حەڵاڵ

داناوه، به نێوی ئاینی ئیسلامەوە بیر و هەستی نیشتمانیان لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا کپ کردوە و سووتاندوە. ئەمە لە کاتێکدا کە گومان لەوەدا نی‌یە کە کورد لە هەموو ئیسلامەکانی دیکەی ئەم خرەی زەوی‌یە پتر پێرەوی ئیسلامەتی دەکەن. تەنانەت ئەوانەی کە خۆیان بە جێگری (وارسی) محمد (ص) داناوە و نێویان لە خۆ ناوە خەلیفەی ئیسلام، بە سەدان کاری نابەجێ‌یان کردوە، هەر لە ئەتک کردنی ئافرەت و خواردنەوە و رابواردنی شەوانی نێو جاریەکان تا دەگاتە ئەوەی کە بە چاوێکی نایەکسانەوە تەماشای جەماوەرەکەیان کردووە و هەمیشە ئەوەیان خستووەتە مێشکیانەوە کە دووعا بکەن لە خودێ بپارێنەوە ئەم خەلیفە (موبارەکانەیان) بۆ بهێڵێ و بپارێزێ. لەمەش بترازێ ئەم "خەلیفە موبارەکانە" بەردەوام هەوڵی ئاژاوە نانەوە و ناکۆکی نێوان سەرەک عەشیرەتەکانی کوردییان داوە و بە پووڵ و پارە هانیان داون یەکدی لە نێو بەرن. سەرۆکە کوردەکانیش کەم و زۆر هەڵخەڵەتێنراون و خزمەتی بێگانەی داگیرکەریان کردووە ئەوجا هەر لە سەردەمی دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و سەفەوی تا دەگاتە ئەورۆ ئەو سیاسەتی دژ بە کوردە، هەر بەردەوامە و تەنێ بۆ ساتێکیش بێت رێی ئەو کوردە ژێر دەستەیان نەداوە لە دەرد و بەڵا و نەزانین و نەخوێندەواری رزگار بێت.

جا حکومەتی تاران ژمارەیەکی زۆری لە عەشیرەتەکانی سەردەشت و بانە دژ بە کۆماری مەهاباد چەکدار کردبوو، ئەم خۆفرۆشە ئەڵقە لە گوێیانە ئازارێکی زۆری خەڵکی بێ دەسەڵاتی نێوچەکەیان دەدا و دێهاتەکانیان دەسووتاندن. پێشینان راستیان ووتووە: "دار دەڵێ بیور (تەور) کلکی لە خۆم نەبێت هەزار ساڵ عومرمە". مەخابن هەر بزووتنەوەیەکی ئازادی خوازی نیشتمانی سەر هەڵدەدات ئەوا بە هەزاران سافیلکەی مێشک پووت خۆ دەهاوێژنە باوەشی دوژمنی داگیرکەر و خۆفرۆشانەوە و، دژ بە مافی میللەتەکەیان دەوەستنەوە.

## یاخی بوونی مەلا خەلیل و عەوڵاغای بایز پاشا

وەک لە سەرەوە باسمان کرد کە (١٨٠) سەربازی نیزامی لەمەهابادەوە هاتن و خرانە نێو جەبهەی سەردەشت و بانە. چوار ئاغای مەنگوڕیان لەگەڵدا بوو: حەمەد ئاغای بایز پاشا کە پلەی (مایۆر)ی هەبوو، هەمزە ئاغا و دوانی دیکەش بە پلەی (مایۆر)ی هەبوو، هەمزە ئاغا و دوانی دیکەش بە پلەی (کەپیتان). پێدەچوو گومانیان لەسەر بووبێت بۆیە خرابونە ژێر فەرماندەیی کەپیتان سەعید زادە کە ئەمەش لە دەستووری سەربازیدا ڕەوا نەبوو مایۆرێک لە ژێر فەرماندەیی کەپیتانێکدا بێت لە کاتێکدا کە پلەی سەربازی یەکەمیان لە دووەم بەرزتر بێت، بەڵام دیار بوو کە ئەمەش جۆرە تاقیکردنەوەیەکی خۆیان بوو کە لە هەمان کاتیشدا ناردبوویاننە نێو ئێمەوە، چونکە کەس و کاری ئەوانە لەو نێوچەیە بوون و ناسرابوون و هەندێکیشیان سەر بە کۆماری مەهاباد نەبوون.

شایانی باسە کە حەزرەتی پێشەوا دەسەڵاتی تەواوی بڕیاردانی لە کاروبارەکانما، دابووە دەست خۆم (دەسەڵاتی دەستووری مکرم) کە بەو پێیە دەمتوانی فەرمان بە کوشتنی هەر کەسێک بدەم لەوانەی خیانەت بەرامبەر نیشتمانەکەیان دەکەن. ئەمەش دەقی ئەو دەسەڵاتەیە کە حەزرەتی پێشەوا پێی ڕەوا بینیم.

بسم الله الرحمن الرحيم

بۆ/ پەدپەڵکۆڤنیک بەکر عەبدولکەریم، فەرمانەدەی جەبهەی سەردەشت و بانە.

"دەستووری مکرمان پێ دان کە لەمەودوا دەتوانی دەسەڵاتی ئێمە بۆ ڕاگرتنی ئاسایشی جەبهە و نێوچەکەتان بە کار بێنی، هەر شتێک بۆ سوودی گشتی، بە پەسەندی دەزانن دەیکەن بە مەرجێک لە بەکار هێنانی ئەم دەسەڵاتە خواو پێغەمبەر (ص) لە بیر نەکەن".

تا ماوەی مانگێک خەریکی ڕێکخستنی کاروباری جەبهە و دەستەبەر (تأمین) کردنی ئازووقە و حەواندنەوە و ئامۆژگاری کردنی دانیشتوانی جەبهەکە بووین. لە هەمان کاتیشدا پێوەندیمان بە چەند کەسانێکی نێو شاری سەردەشتەوە کرد و ئامادەی ئەوەمان کردن کە لە جموجۆڵی دوژمن و دەنگ و باسیان ئاگادارمان بکەن، لەبەری سوێسنایەتی بۆ ئەو پۆستەی کە لەسەر ڕێگەی "ئاڵوتان"وە دێت بۆ سەردەشت، مایۆر حەمەد ئاغای بایز پاشا و چەند سەربازێک و ژمارەیەکیش لە بارزانی دانران. ڕۆژێک حەمەد ئاغا هاتە لام، نامەیەکی لە عەولا ئاغای برایەوە بۆ هاتبوو پیشانی دام و ئەمەش دەقی ئەو نامەیەیە.

برای خۆشەویستم کاک حەمەد
دوای چاو ماچکردنتان

"ئەتۆ گەر کوڕی بایز پاشای و برای منی، زۆر شەرمە بە دوای هەتیو تاڵی سابلاخیان بکەوی. دەبێت لەگەڵ ئێمە بیت، نەک لەگەڵ ئەو خودا نەناسانە. پێم خۆشبوو کەوا لەم نیزیکانەی سەر ڕێگامانی، بگەڕێوە نێو ئێمە. مامۆستا مەلا خەلیل چاوت ماچ دەکات و (٣٠٠) کەسمان لەگەڵە و دەڕۆین بۆ سەردەشت بە برای خۆمت نازانم لە قسەم دەربچیت و لە دژمان ڕاوەستی، جا کەیفی خۆتە. ئەگەر ڕێگامان لێ بگرن ئەوا بە قووەت ڕێگەی خۆمان دەکەینەوە".

گەلێک سوپاسی ئەو دڵسۆزییەی حەمەد ئاغام کرد و پێم ووت: پێم ناخۆش نییە گەر نەتەوێت لەو پۆستەی براکەت بی. ئەوا ساڵەح عەبدولعەزیز ئاغا و دەستەکەی لەوێن. دەزانم کە بۆ تۆ ناخۆشە لە شەڕی دژ بەواندا بەشدار بیت. لە وەڵامدا ووتی: "ئێستە من خۆم بە کوڕی بایز پاشا دەزانم کە دژ بەو برایەم ڕابوەستم کە خۆی هاوێشتۆتە باوەشی دوژمنی کورد، حاشا لەو برایە دەکەم و پێویستە من لە هەموو کەس زێتر دژی بوەستم".

پاش دڵنیا بوون لەو هەڵوێستە، چەند سەربازێکی دیکەم لەگەڵدا نارد بۆ لای کاک ساڵەح عەبدولعەزیز و فەرمانم بۆ ناردن کە عەولا ئاغا و تاقمەکەی وریا بکەنەوە و ئاگاداریان بکەن کە هەر لە ئێستەوە تا ماوەی (٢٤) کاتژمێری دیکە:

١- بچن بۆ مەهاباد تا حەزرەتی پێشەوا لە تاوانکارییان بیانبەخشێ.

٢- یاخود خۆیان بەدەستەوە بدەن، خۆ ئەگەر نا بە توندی لێیان دەدەین و ئۆباڵیان بە ئەستۆی خۆشیان. لە هەمان کاتیشدا ساڵەح ئاغام ئاگادار کرد، گەر هاتوو ویستیان بەرەو عێراق هەڵبێن (لە سنوورەوە نیزیک بوون) ئەوا تەقەیان لێ نەکرێت.

پاش چەند کاتژمێرێک هەواڵم بۆ هات کە مەلا خەلیل چووتە خزمەت حەزرەتی پێشەوا بۆ مەهاباد و عەولائاغا و (٦٠) کەسیش لەگەڵ وی، بۆ قەلادزێ هەلاتبوون.

لە هەمان کاتدا حەمەد ئاغام لە جێگای کەپیتان سەعید زادە دانا و کردمە فەرماندەی هێزەکەی و کارێکی سەربازیی دیکەم بەو سپارد. چونکە گومانم لە هەڵسووکەوتی هەبوو و دەترسام کە رۆژێک دوژمن بە تەواوی لە دەرفەتێکدا سوودی لێ وەربگرێ.

پاش ئەوە نێوچەی سوێسنایەتی لە خۆفرۆشان پاک کرایەوە، پێوەندییەکی نهێنیم لەگەڵ نەسروڵلا خاندا دروست کرد. ئەم خانە (٥٠٠) چەکداری لە نێوچەی بانە هەبوو و لەگەڵ حکوومەتی تاراندا بوو. هەمان پێوەندیم لەگەڵ ژمارەیەکی دیکەشدا پەیدا کرد وەک:

عێزەت خان، قادر خان و چەند کەسێکی تر، کە هەریەکەیان خاوەنی چەند سەد چەکدارێک بوون و جاش بوون. رێکەوتنەکەمان لەگەڵ نەسروڵلاخاندا بە نهێنی بوو. بەڵێنی دامێ کە لە کاتی پێویستدا وەلامی بۆ بنێرم تا بێنە رێزی لە شکری کوردستانەوە، هەر واشمان بە بەرژەوەند

زانی کـە جـارێ لە جـێگەی خـۆی بمێنێ. ئەوەشـمـان باش دەزانـی کـە لە جەبهـەی بانە پێـویسـتـیمـان بەو دەبێت و ئەو دەمە ئاگاداری دەکەین کە بە ئەرکی پێویست هەڵبسێت.

## شەڕی جەژنی قوربان

بە بۆنەی جەژنی قوربانەوە زۆر لەسەربازەکانی ئێمە کە خەڵکی نێوچەی سوێسنایەتی بوون و لە بنکەکانی دەوروبەری سەردەشت بوون بێ ئەوەی ئاگاداری فەرماندەکانیان بکەن گەڕابوونەوە نێو ماڵ و منداڵیان، تەنێ ئەو (١٨٠) سەربازەی مەهاباد و ژمارەیەکی کەمی دیکە نەبێ کەس نەمابۆوە. بێگومان دوژمن ئەمەی بە هەل زانی و هەر لە یەکەم شەوی جەژندا هێرشی بردە سەر قەڵای وارشو - شینوێ و لەوێوە بەرەو گوندی مەلا شێخ. لەبەرە بەیانیشدا (٣) فڕۆکەی دوژمن رەبەتی بۆمبابارانی کرد کە دونیا تەواو رووناک بۆوە، دیمان دوژمن تا گوندی مەلا شێخ هاتووە و خۆی لێ دامەزراندوە. هێزەکەی ئێمەش بێ سەروبەران کشاونەتەوە ئێمەش ئاگادار نەکرد بوو دەستو بردانە (٦٠) چەکدارم لە پاسەوانەکانی بنکەی رەبەت خستە ژێر فەرماندەیی ساڵەح عەبدولعەزیز. ئەم هێزە لە رووباری کەڵوێ پەڕینەوە و هێرشیان بردە سەر دوژمن لە گوندی مەلا شێخ. ئەو ئافرەتانەی کە لە ژێر شالاوی دوژمن، بەرەو رووباری کەڵوێ هەڵاتبوون، مەردانە و بێ ترس بە گۆزە ئاو و هەلهەلە لێدان بە دوای سەربازەکانی ئێمە کەوتبوون و بەرەو رووی سەنگەرەکانی دوژمن ببوونەوە. بە نارنجۆکی دەستی جێ بە دوژمن لێژ کراو کوشتارێکی باشی لێ کراو بەرەو سەردەشت هەڵاتن. سەربازە دلێرەکانمان بە دوایاندا چوو بوون تا لەسەردەشتیش بەدەریان نابوون، بەڵام مەخابن قارەمانێکی ئێمە، حەسەن خانی بەرباجی کە هێرشی بردبووە سەر تانکێک (ئەم تانکە تەنێ یەک گوللەی پێ مابوو)و شەهید بوو. تانکەکەش توانی لە هێرشی کورد رزگاری بێت. لە هەمان کاتدا کە سەربازەکانمان خەریکی گواستنەوەی لاشەی ئەو کوردە قارەمانە بوون، سەر لە نوێ دوژمن دەرفەتی بۆ رەخسا و خۆی گەیاندەوە نێو شاری سەردەشت، پەلێکی دیکەی دوژمن هەر لە هەمان شەودا قەڵای وارشیان گرتبوو، پاش هێرشی سەربازەکانمان بۆ سەریان چەکەکانیان فڕێ

دابوو و هەڵاتبوون، بەڵام کە زانیبوویان ڕێگەی نێو شاریان لێ گیراوە چووبوونەوە قەڵا و لەوێ مابوونەوە.

زیانی ئێمە لەم شەڕەدا یەک شەهید و (٥) بریندار بوو و زیانی دوژمن (٢٢) کوژراو بوو کە یەک لەوان فەرماندەکەیان بوو: "کەپیتان خەلعەت بەری".

دەستکەوتمان (٢) ڕەشاشی گەورە، (١٨) بڕنەو، چەند سندوقێک نارنجۆکی دەست، لەگەڵ تەقەمەنییەکی زۆر.

تا ئەم کاتانەش وتووێژی کۆمار و حکومەتی تاران هەر بەردەوام بوو، بەڵام جارجارە دوژمن هێزی خۆی تاقی دەکردەوە و تاوانی هێرشەکانیشی دەخستە مل ئێمە، کە گوایا ئێمە دەست پێشخەر و تاوانبارین.

دوای ئەو شەڕە بە ماوەیەک فەرمانێکم لە لایەن پێشەوای مەزنەوە بۆ هات کە لەمەو دوا جەبهەی سەردەشت و بانە نێو بنرێ (نیگەهبانی سەردەشت و بانە)، واتە پاسەوانی سنوور. وا دیار بوو کە لەگەڵ حکوومەتی تاراندا لەسەر گۆڕینی ئەو نێوە و هەندێ شتی دیکە ڕێککەوتبوون، وەک: ڕێگە دان بە ئازووقە و خواردەمەنی بە لەشکری ئێران لە بانەوە بۆ سەردەشت بە مەرجێک نوێنەری کۆماری مەهاباد لەگەڵ هاتووچۆی ئەو کاروانانەدا بێت، بەڵام چەک و پێداویستی جەنگی قەدەغەیە و ڕێگەی دەرچوونی نەدرێت.

## کۆبوونەوەم لەگەڵ سەر لەشکر ئایرووم دا

مـانگێـک بەسـەر شـەڕی جـەژنی قـورباندا تێپـەڕی کـردبوو، لە لایەن پێشـەوای بەڕێزەوە ئەم فەرمـانەم بە دەست گەیشت: "سەرلەشکر ئایرووم داوای لە تاران کـردووە کـە کۆبوونـەوەیەک لەگەڵتاندا ڕێک بخرێ بۆ جێ بەجێ کـردنی ئـەو گـیروگرفتـانەی نێوانتـان بە ڕێیـەکی ئاشـتیـخـوازانە. تارانیش لەو بارەوە پێـوەندی بە ئێـمەوە کـردووە. ئێـمـەش بڕیارمـاندا ئەو کۆبونەوەیەی نێوانتـان ساز بکرێ و لە شوێن و کاتەکەی هەردوو لاتان لە سەری پێکدێن".

دووا بە دوای ئەوە نامەیەکم لە سەرلەشکر ئایروومەوە پێ گەیشت، کە تێیـدا ئامـادەیی خـۆی پێشـان دابوو، کـە فـڕۆکـەیەکم بە دوودا بنێرێ تا بمگەیێنێتـە سـەردەشت. لە وەڵامـدا بۆم نووسـیبـوو کـە: "کۆبوونـەوەکـەمـان پێویست ناکات لە سـەردەشت بێت، بەڵکو لە کولتی بێت کە فـەوجـێکی ئێــوەشی لێیە و زۆر لە ڕەبەتیــشــەوە دوور نییە. ناردنی فــڕۆکــەش بە پێویست نازانم".

ڕۆژێکیشم بۆ کۆبوونەوەکەمان لە نامـەکەدا دیاری کرد و بەو جۆرە هەر دوو لا ڕێککەوتین.

لە ڕۆژی دیاری کـراودا (١٥٠) سـەربازم نارده کـولتی. کـە لەوێ بچنە سەنگەر و قـوللەکانی بنکێی کولـتی و لەگەڵ سەربازە ئێرانـییەکاندا بن، ژمارەیەک سەربازیشم لە دەرەوەی کولتی، لە چەند بەرزاییەک دامەزراند. پاشان بە خۆم و (٢٠) چەکداری سوارەوە بەرەو کولتی کەوتینە ڕێ، لەوێ سەرلەشکر ئایرووم و سەرگورد کشاوەرزی چاوەڕوانیان دەکردین.

لە خـێــوەتێکدا مـن و ســەرلـەشکر ئایرووم و ســەرگــورد کــشــاوەرزی کـۆبوونەوەکـەمـان دەست پێ کـرد و حـەسـەن ئاغـای ڕەئیس، کـە سـەر بە حکوومەتی ئێران بوو، تەرجوومانمان بوو.

سەرەتای دانیشتنەکەمان بە میوانداریتی و هەندێک وتوێژکردن بردە سەر، پاشان سەرلەشکر ئایرووم دەستی بە قسەکردن کرد و ووتی: " ئێمە وەک دوو دۆست ئێستە لەگەڵ یەک دانیشتووین، چونکە حکوومەتی شاهەنشا دانی بە خودموختاری‌یەکی کۆنفدراڵی بۆ کورد داناوە، من وەک سەرلەشکرێکی حکوومەتی شاهەنشا و ئێوەش وەک فەرماندەی پاسەوانی سنووری کوردستانی خودموختارین لە چوار چێوەی خاکی ئێراندا، لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات کە هیچ جۆرە روودان و ئاژاوەیەک لە نێوانماندا روو بدات. پێویست وایە هەردوو لامان بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە یارمەتی یەکدی بدەین. ئێستەش ئێمە چەند داوایەکمان هەیە، کە ئومێد دەکەین جێ بەجێ بن.

**ئەمەش داواکانمانن:**

١- ئەو پۆستەی کە ئێوە لە نێوان کولتی - سەردەشت دا، داتان ناوە گەلێک نارەحەتی و گیروگرفتی بۆ سەربازەکانمان خولقاندووە. جا بۆ ئەوەی ئەم پۆستەتان چی دیکە تەشقەڵە بە سەربازەکانمان نەکەن و نەبنە کۆسپ لە رێی هاتوو چۆیاندا پێویستە کە لا ببرێت.

٢- رێگە بدرێتە نوێنەرەکانمان، کە هاتووچۆی ئەو دێهاتانەی ژێر دەسەڵاتتان بکەن، بە مەبەستی کرینی دانەوێڵە و کاو جۆ و هەندێک شتی پێویستی دیکە، بەرامبەر بەوە دوو ملیۆن تمەن وەک دیاری دەدەینە هێزەکانتان کە ئێوەش پێویستی‌یەکانتانی پێ جێ بەجێ بکەن.

سەرلەشکر ئایرووم لە قسەکان بووەوە و لەوەڵامدا پێم گوت:

١- گەر رێکەوتن هەیە لە نێوان کورد و تاراندا و مافی حکوومەتی فیدراڵی لە چوارچێوەی ئێراندا، بە کورد دراوە، دەیسا هێرشی هێزەکانتان لە رۆژێکی پیرۆزی وەک جێژنی قوربان بۆ سەر بنکەکانمان لە ناوچەی سوێسناییەتی بە چ دەژمێردرێ؟ ئایا ئەو رۆژە لای گشت

موسوڵمانان پیرۆز نییه؟

٢- ئایا ئاژاوه نانهوه و پرۆپاگانتــهی ســهرههنگ پزیشكیــانی ئێــوه له سهردهشت و بانه و نێوچهكانی دیكهی ژێر دهسهڵاتتان به چ دهقهبڵێن كه كۆماری مههاباد و سهركردهكانی و هێزی كوردستان دهكاته خوانهناس؟.

ئایا ئێمه ئاژاوهمان ناوهتهوه یاخود ئهو عهشیرهتانهی بانه كه سهر به ئێوهن و دێهاتهكانیان سووتاندووه و دانیشتوانیان به دهرناوه و ئێسته له رهبهتن و ماڵیشیان به تالآن بردوون. ئایا ئهوانه خهڵكی ئێران نین؟ ئهگهر وایه بۆ چ ئهو جۆره مامهڵهیان لهگهڵدا دهكهن؟ لهگهڵ ئهوهشدا ئێمه خۆشحاڵین كه دۆستایهتی له نێوماندا دروست بێت و گیروگرفتهكانمان به ڕێیهكی ئاشتیخوازانه چارهسهر بكهین.

٣- داوای یهكهمتان بۆ لابردنی پۆستی نێوان كولتی – سهردهشت بهجێ دێنم و پۆستهكه دوور دهخهمهوه، تا بزانن و لهوه دڵنیا بن كه ئێمه شهڕمان ناوێت. راستییهكی ئهو پۆسته سهعید زاده داینابوو، جێگهكهی گهلێك ناهموار بوو، له دۆڵێكدا بوو گهر دوژمن ئارهزووی لێدانی ههبایه به ئاسانی له نێوی دهبرد. ههر بهر لهوهی كه ئایرووم داوای لابردنی بكات، من خۆم بیرم له گواستنهوهی كردبووهوه.

٤- داوای دووهمتان سهبارهت به كڕینی دانهوێڵه و شتی پێویست، ئهوه پێویست بهوه ناكات كه نوێنهرهكانتان خۆیان ماندوو كهن و دێ به دێ بگهڕێن، لهبهر ئهوهی من شتهكانی دیكهیان بۆ ئاسانتر دهكهم. من ڕێگه به ههموو ئهو كهسانه دهدهم كه دانهوێڵه و كاو شتهكانی دیكهیان بێ كۆسپ خستنه ڕێ ببهنه شاری سهردهشت و بیانفرۆشن.

٥- سهبارهت به دیارییهكهتان (٢ ملیۆن تمهن)، وهرم گرت و وا منیش دهیكهمهوه دیاری بۆ سهربازهكانی خۆتان، پێم وایه كه سهربازهكانی ئێوه پتر پێویستییان پێی ههبێت چونكه دهوڵهتی شاههنشایی ئێران،

بۆ هەر سەربازەی، مانگی یەک تمەن دادەنێ، بەڵام هەر یەک لەسەربازەکانی ئێمە مانگانە (١٢٠) تمەن وەردەگرێ، جگە لە ئازووقەی خۆی و ماڵ و منداڵی.

ئەوجا داوام لێکرد کە ئەوانیش ئەم داوایانەی ئێمە جێبەجێ بکەن:

١- لابردنی سەرهەنگ پزیشکیان لەسەر دەشت لەبەر ئەوەی مرۆڤێکی پرۆپاڵانتەچی، ئاژاوەچی و تێکدەرە.

٢- حەمەد قادر نێوێک کە ئێستە لای سەرهەنگ پزیشکیانە لەسەردەشت، ئەسپێک و تفەنگێک و دەمانچەیەکی لە شارەوانی مەهاباد فڕاندووە و دەبێت بە هۆی شتەکانەوە بیدەنەوە دەست ئێمە.

٣- رێگەدان بەهەر سەربازێکی ئێمە کە بە چەکەوە بۆ شت کڕین یاخود بۆ سەردانی کەسوکاری دێتە سەردەشت.

٤- هەر کەسێکی ئەهلیی کە پسوولەی ئێمەی پێ بێت رێی لێ ناگیرێت بۆ هاتنە نێو شاری سەردەشت.

پاش سێ کاتژمێر وتوێژی نێوان یەکدی، لەسەر ئەو خاڵانەی سەرەوە رێککەوتین... پاش ئەوە چوومە مەلا شێخ بۆ سەردانی بنکەکەمان.

پاش دوو رۆژێک ئەو دەمانچە و تفەنگ و ئەسپەی کە حەمەد قادر، رفاندبووی بۆمان هاتەوە و نامەیەکی سەرلەشکر ئایرووميشی لەگەڵدا بوو کە لەوێدا نووسیبووی: "وا ئەو شتوومەکانەمان بۆ ناردنەوە، بەڵام حەمەد قادر بەرەو عێراق هەڵاتووە. هەروەها لەسەر داوای ئێوە سەرهەنگ پزیشکیانمان لە سەردەشت گواستەوە".

شایانی باسە دووایی وەک بیستمەوە، حەمە قادر و سەرهەنگ پزیشکیان رۆیشتبوون بۆ سلەیمانی. سەرهەنگ بە کارێکی تایبەتی دەوڵەت نێردرابوو، لەوێش راپۆرتێکی دوور و درێژی دژ بە من دابووە حکوومەتی عێراق.

# شەڕی مەکلاوە

مەکلاوە گوندێکە، کەوتووەتە سەر ڕێگای نێوان سەردەشت و بانە. لەوێ پۆستێکی ئێمە بە سەرکردایەتی کاک حەمەد مەولود، بۆ چاودێری ئەو ڕێگەیە داندرابوو. مانگێ تێپەڕی کردبوو بەسەر کۆبوونەوەکانماندا، دەگەڵ سەرلەشکر ئایرووم، چوار بارزانی بۆ کڕینی هەندێک شتوومەکی پێویست بۆ مەکلاوە دەچوون دەبینن کە ستونێکی (رتل) سەربازی ئێرانی، (٤) تانک و زرێ پۆشیان لەگەڵە و ماشینەکانیشیان بە سەرباز و چەک تەنراوە و نیازیان هەیە لەمەکلاوە بەرەو سەردەشت تێپەڕن. سەرلەشکر ئایروومیشیان لەگەڵ دەبێت.

بارزانی‌یەکان دەستوبردانە دادەمەزرێن و ئیشارەت دەدەنە ماشینەکەی سەرلەشکر کە ڕابوەستێ. لەو کاتەدا کە ماشینەکەی سەرلەشکر دەیەوێ دوور بکەوێتەوە نارنجۆکی تێ دەسرەوێن، بەڵام بە داخەوە هیچیان ناتەقنەوە، لەم هێنان و بردنەدا شەڕ بە گەرمی دەست پێدەکات، جەماعەتی حەمەد مەولودیش کە لە نێو گوند دەبن دەکەونە نێو شەڕەکەوە، مەکلاوەش زۆر لە ڕەبەتەوە دوور نی‌یە و لەگەڵ بە دەنگ هاتنی تەقەکان. دەستوبردانە چەند بارزانی‌یەکم ئامادە کرد، لە هەمان کاتیشدا (١٠٠) سواری گەورک کە لەگەڵ کاکەڵڵا ئاغا لە ڕەبەت بوون پێکەوە بەرەو مەکلاوە ڕۆیشتین، ویستمان لە دوو لاوە ئابلۆقەی شەڕەکە بدەین، پێش ئەوەی بگەینە ناو شەڕەکە دوژمن چاوی بە هێزەکەمان کەوت کە بە هاوکاری کاک حەمەد مەولود و هێزەکەی دەچین، هێندەیان پێ کرا، کە بەرەو سەردەشت هەڵبێن، کە گەیشتینە مەکلاوە دیتمان، چواردە کەس لە دانیشتوانی گوند بە دەستی دوژمن شەهید و بریندار کراون، سەربازێکی کاک حەمەد مەولودیش شەهید کرابوو، زۆر بە پەلە بریندارەکانم ڕەوانەی مەهاباد کرد، کە لەوێشەوە بنێردرێن بۆ نەخۆشخانەی تەورێز، چوار منداڵی بێ باوک لە یەک ماڵدا خراپ بریندار کرابوون.

سەبارەت بەو رووداوە راپۆرتێکمان بۆ مەهاباد نووسی و ئەوانیش تارانیان ئاگادار کرد لە چۆنیەتی شکاندنی پەیمان و رێکەوتننامەی هەردوو لا، لە لایەن سەرلەشکر ئایروومەوە داوایان لە تاران کرد کە زۆر بە توندی ئایرووم سزا بدرێت.

پاشان فەرمانێکم لە لایەن پێشەوای بەرێز بۆ هات (ئەو هێزەی من پێوەندی تەنێ بە شەخسی پێشەواوە هەبوو، لەبەر ئەوە فەرمانم لە هیچ کەسێکی دیکەوە وەرنەدەگرت) کە جارێ ئێمە هیچ هێرشێک نەکەینە سەریان، بەڵکو لیژنەیەک لە نوێنەرانی تاران – مەهاباد بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم کارەساتە پێک دێت تا تاوانباری هەڵوەشاندنەوەی رێکەوتننامەکە سزا بدرێت.

## سەرەتای ساڵی ١٩٤٧

ئەو لیژنەی لێکۆڵینەوەیەی کە پێویست بوو پێک بێت تا ئەورۆکەش نە ڕەنگی هەبوو نە بۆنی. کـاتێکی زۆر تێـپـەڕی کـرد و چەند ئاڵایەکی کوردستانم بۆ هات کە گوایا حکومەتی ئێران بەڵێنی داوە تا نەورۆزی ئەو سـاڵە ١٩٤٧ لـە شکرەکـەی لە سـەردەشت و بانە راگـوێز کـات و بە بێ شەڕکردن هێزی کۆماری مەهاباد جێگای بگرێتەوە و ئەو ئاڵایانەش لەسەر دەزگاکان (دائیرەکان) هەڵبکرێن.

بەڵام لە راسـتیدا کـە لە بارودۆخـەکـە وورد دەبوومـەوە و سـەرنجی جموجووڵی هێزەکانی ئێرانیشم دەدا، مەسەلەکەم بە چەشنێک دەهاتە پێش چاو کە مەترسی لێ بکرێت، پێ دەچوو کە ئێرانییەکانی جگە لە فرت و فـێڵ و خـۆ ئامـادەکـردن بۆ کـارێکی گـرنـگ هیـچی دیکەیان لێ چاوەڕوان ناکرێت، ئەو بارودۆخە وای لێ کردم کە نامەیەک بۆ پێشەوای مەزن لەم بارەوە بنووسم، لەوێدا ئەوەم خستبووە بەردەست پێشەوا کە: "هەڵویست و جـمـوجـوڵی حکومـەتی ئێـران هیچ پێ ناچێت کـە بە ئاشتی لە شـارەکـان دەربچن، بەڵکو بە پێـچـەوانەوە من وا تێدەگەم کـە کـارێکی گـرنگیـان بەدەستەوە بێت. خۆ ئەگەر نا پروپاگانـدەی دژ بە ئێمەیان و نامە نووسین و بەڵێنی ئاڵ و والا بە عەشیرەتەکان جێی گومـان کـردنە و دیارە کە دوژمن پتر خەریکی خۆ قایم کردنە".

دوای شـەڕی مەکـلاوەش بە یەکـجـاری ڕێگەی نێـوان سەردەشت و بانەم گرت و هاتووچۆ کردنی سەربازەکانی ئێرانیم بەوێدا قەدەغـە کرد. لە هەمان کـاتیـشـدا وەڵامم نارد بۆ سەرلەشکر ئایرووم کـە تا لیـژنەی لێکۆڵینەوە نەیەت ئەوا لە هەر سەربازێکتان دەدەین کە بەوێدا تێپەڕێت و پێشەواشم لەو بارەوە ئاگادار کرد. هەروەها هێزەکانم لەو جێگە ستراتیژیانە دامەزراند کە دەمانتـوانی بەربەرەکانی دوژمن بکەین و دەستی لێ بوەشێنین، داواشم لەمـەهاباد کـرد کـە هێـزێکی دیکەشم بۆ بنێـرن، خـۆ ئەگـەر لە تواناداا بێت

پەلێک تۆپخانەش، کە ئەو دەمە دەتوانم بە ئاسانی سەردەشت بگرم.

دوو هەفتە بەسەر نامەکەدا تێپەڕی کردبوو، سەرهەنگ عەزیمی، کە ئەفسەری پێوەندی (ارتباط) یەکەم بوو و خۆی و هێزی فەرماندەی لە میاندواو دادەنیشتن، هاتە رەبەت و پێشوازیمان لێ کرد. دوای کەمێک پشودان گەشتێکمان بە بنکەی هێزەکانمانا لەبەری سوێسنایەتی و گەورکان کرد. گەلێک خۆشحاڵی و رەزامەندی سەبارەت بە ڕێکوپێکی و ورەبەرزی سەربازەکانمان پیشاندا.

سەرهەنگ عەزیمی کە لە کۆماری تەورێزدا گەلێک لە پێش و بە دەسەڵات بوو، مرۆیەکی دەستە پیاو و رووخسار جوان و لێهاتوو بوو. وەک بۆم دەرکەوت ئەفسەرێکی بە توانا و زانیارییەکی تەواویشی لەسەربازیدا هەبوو. پێی ووتم داخوازیەکانتان چی‌یە؟ پێم ووت: بەرەو زستان دەچین و رەنگ هەیە کە لەبەر بەفر و باران هاتوچۆی نێوان ئێمە و مەهاباد زۆر زەحمەت ببێت و گەلێک جار بە تەواوی نامێنێ، لەبەر ئەوە پێویستیمان بە (٦) شەش مانگ ئیحتیاتی ئازوقە و خۆراک و فیشەک هەیە بۆ هێزەکانمان. چونکە دەبێت زۆر وریا بین، نەبادا دوژمن دەرفەت لەم زستانە وەربگرێ و هێرشمان بێنێتە سەر، بە دوریشی نازانم کە دوژمن دەست بوەشێنێ و لەبەر ئەوە پێویستە کە ئێمە دەست پێش خەر بین و بۆ ئەو مەبەستەش پێویستیم بە پەلێک (فصیل) تۆپ هەیە، واتە (٣) تۆپ، خۆ ئەگەر ئەو تۆپانە لە دەستدا بن، ئەوا بە ئاسانی سەردەشت دەگرم، چونکە ئەو قوللانەی دەوری سەردەشت بە تۆپ نەبێت وێران ناکرێن، خۆ ئەگەر نا بێ ئەوانە هێرش بردنمان بۆ شار زیانێکی زۆرمان لێ دەدات خودا پشتیوانمان بێت ئەو بطریە (١٢) تۆپەی سەردەشت بە هی خۆم دەزانم.. ئەوەشم ئاگاداری سەرهەنگ عەزیمی کرد کە ژمارەیەک لەسەربازی جەربەزە و چالاکم خستووتە نێو شاری سەردەشت کە لە کاتی هێرش بردنمان بۆ سەر شار دەتوانن دوژمن بشڵەژێنن و سەری لێ بشێوێنن، کە ئەمەش کاری ئێمە گەلێک ئاسان دەکات، بەڵام تەنێ کۆسپ لە

پێشماندا هەر قوللەکانن کە چارەی ئەمانەش بە تۆپ دەکرێن. سەرهەنگم لەوەش ئاگادار کرد کە هێزێکیشم بۆ (قوەی اعزامی) ئیحتیات پێ دەوێ.

سەرهەنگ عەزیمی لەوەڵامی قسەکانمدا ووتی: "سەبارەت بە خواردەمەنی و ئازووقە و تەقەمەنی سووک، چ کاتێک چوویتەوە مەهاباد سەردانێکی مـیـانـدواویش بکە ئەم شـتـانـەت وورده وورده جێ بەجێ دەکـەم، بەڵام تۆپەکان لە کۆماری تەورێز داوا دەکەم ئەم شتانەت لە ماوەی ٢-٣ مانگدا بۆ ئامادە دەکەم، هەر چەندە تارماییەکی رەش لە ئاسمانی ووڵاتدا بەدی دەکرێ و هەندێ لە بێگانە، زرووفێکی سیاسی نالەباریان بۆ دروست کردووین، بەڵام ئومێدەوارم کە لەم تاریکی‌یە دەربچین و بەرەو رووناکی برۆین. پێم خـۆشـە لەمـیـانـدواو چاوم پێت بکەوێت هەندێ لە داخوازی‌یەکانت بە پەلە بۆ جێ بەجێ بکەم".

پاش ئەوە بە مانگێک چوومە مەهاباد و ئەو وتوێژەی لە نێوان من و سەرهەنگ عەزیمی‌دا کرابوو پێشکەش بە پێشەوام کرد. پاشان لەگەڵ بەرێزیدا چووینە بارەگای حیزب، لەوێ تاقمێک لە جوقی مۆسیقای سەربازیمان لە تەورێزەوە بۆ هاتبوو، هەر وا تەماشامان دەکرد. بۆریەک کە لە هەموو ئەوانی تر گەورەتر بوو، رووم کردە پێشەوا ووتم: خۆزیا لە بری ئەمانە دوو تۆپیان بۆ دەناردین. فەرمووی دەمێکە هەوڵ دەدەم، بەڵام رووسەکان ناهێڵن کە بماندرێتێ. ووتم: هەر چۆنێک بێ قەناعەتی ئەوەیان پێ بکە کە بەکارهێنانی ئەو تۆپانە تەنێ بە فەرمانی جەنابت دەبێت، بۆ ئەوەی چی دی کە گومان و مەترسی‌یان نەمێنێت و گەر هاتوو تۆپەکانیان داینێ ئەوا تۆپەکان بدەنە من و فەرمانێکی زۆر توندیشیان لەگەڵ بنێرن کە بەکارهێنانی ئەو تۆپانە قەدەغەیە تەنێ بۆ پاراستنی بنکەکە نەبێت، ئەو دەمە کە منیش هەلم بۆ هەڵکەوت تۆڵەی کوشتاری دوژمن دەکەمەوە کە لە خەڵکی بێ تاوانی مەکلاوە کردی و پەیمانی شەڕ راوەستانەکەیان شکاند. بە پشتیوانی خودا لەماوەی شەو و رۆژێکدا بانە و سەردەشت بەو تۆپانە دەگرم. ئەوسا لەسەر شکاندنی فەرمانەکەتان من بدەنە دادگاو با تیر باران

بکریم خۆ ئەگەر ئەو دوو نێوچەیە لە دوژمن بستێنمەوە ئیدی جارێکی تر نایدرێتەوە.

پاش ئەوەی لە قسەکانم بوومەوە، پێشەوا کەمێک راوەستا و تەماشایەکی کردم و چاوەکانی فرمێسکی تێدا قەتیس مابوو، پەلی گرتم و چووینە دەرەوە و فەرمووی:

"سەرهەنگ عەزیمی گەلێکت لێ رازییە و لە وەزعی هێزەکەشت خۆشحاڵە و داوای کردووە کە بچیتە میاندواو، کاری پێت هەیە. با بزانین خوا چی دەکات، بەڵام هەندێک تەم و مژ ئاسمانی وڵاتەکەمانی داپۆشیوە و گەر ئەمە نەمێنێ ئەوا هەموو جۆرە چەکێکمان دەبێت. جارێ وتوێژ لە نێوان "قەوامولسەڵتەنە"و رووسەکان هەیە کە ئیمتیازی پشکنینی نەوت لە ئێران و دەریای خەزەر بدەنە رووسەکان، بەڵام هیوادارم روسەکان بە بەڵێنی قەوام هەڵنەخەڵەتێن".

هەروەها ماشینێکی تازەشیان بۆ هاتبوو، ئەویشی پێدام و داوای لێ کردم کە بچمە لای سەرهەنگ عەزیمی.

چووم بۆ میاندواو و لەوێ لەگەڵ سەرهەنگ عەزیمی و سەرکردایەتی هێزەکەی کۆبوومەوە. سەبارەت بە زرووفی وڵات و هێزەکانمان و پێویستی جەبهەکان دووایین. وا دەردەکەوت کە سەرهەنگ عەزیمی مەترسی لەو ووتوێژەی نێوان قەوامولسەڵتەنە و رووسەکان هەیە و پێی ووتم: "کە قەوامولسەڵتەنە باش دەناسێ و دەزانێت چ کەڵەک باز و کۆنە لە سیاسەتدا. دوور نییە کە رووسەکان هەڵبخەڵەتێنێ، قەوام پەروەردەی ئینگلیزەکانە و ئێستە ئەمریکا پشتیوانی لێ دەکات، خۆ ئەگەر بێت و رێک بکەون ئەوا دوور نییە رووسەکان دەستبەرداری کوردستان و ئازەربایجان بن و مەیدانیش بۆ ئینگلیز و ئەمەریکا چۆڵ بکرێت". پاشان ووتی: کە هەر لە سبەینێ بە دواوە ئازووقە و شتومەکی پێویستی بۆ هێزەکەمان دەنێرێتە رەبەت کە بەشی زستان بکات. هەندێک پارەشی پێدام، کە پێویستی بنکەکانی پێ جێ بەجێ بکەم.

پاشـان گـەڕامـەوە بۆ مـەهاباد و تەواوی ئەنجـامی دانیـشـتنەکـەمـانم پێـشکەش بە پێـشـەوا کـرد. دووایی بەرەو رەبەت گـەڕامـەوە. وردە وردە ئازووقەمـان بۆ دەهات و خەزنم دەکرد، مـاشینەکانیشمـان پڕ لە دار دەکرد و دەمـانناردەوە بۆ بارەگـای حـیـزب لەمـەهاباد، کـە بەسـەر ئەو مـاڵانەی کـە پێویستیان پێیەتی دابەش بکرێت. هەروەها مەبلەغێک پارەشمان بە چەند گوندنشینێک دابوو کە دار بکڕن، ئەوانیش مەردانە بەم کارە هەڵدەستان.

هەر لەسەر داوای من ژمارەی (٤٠٠) چەکدار لەگەڵ زێڕۆ بەگی هەرکی نێـردران بۆ هێـزەکـەم، منیش لە گـوندی (هەمـران)م دانان بە نێـوی ئیحـتیـاتەوە بۆ پاراستنی پشـتی جەبهـەکەمـان. لە لایەکی دیکەوە درێژە پێدانی وتوێژی نێـوان قەوامولسـەڵتەنەو رووسەکـان بووە هۆی بەسـتنی پەیمانێک لە نێوان هەر دوولایاندا کە بەو پێیە ئیمتیازی پشکنینی نەوتی سـەرووی (باکـووری) ئێـران لە کـەناری دەریای "خـەزەر"ەوە بدرێتـە رووسەکـان، بەڵام دان پێدانان و پەسەندکـردنی ئەو پەیمانە خرایە ئەستۆی ئەو پەرلەمـانە نوێیـەی کـە دەبوا سـەر لە نوێ هەڵبـژێردرێتـەوە. پاش ئەو رێکەوتنە دوو قـۆڵـیـیـەی هەردوولا و بەپێی ئەو پیـلانەش کـە هەردوولا سـازیـان کـردبوو: نەهێـشـتنی هەردوو کـۆمـاری ئازەربایجـان و مـەهاباد، برووسکەیەک لە تارانەوە ئاڕاسـتـەی سـەرەک کـۆمـاری تەورێز "جـەعـفـەر پیـشـەوەری" کـرا کـە لەوێدا هـاتبـوو: "هێـزی شـاهەنشـا دێتـە تەورێز بۆ سـەرپەرشتی کـردنی هەڵبـژاردنی پەرلـەمـانی نوێ تـا رێ لە هەمـوو فـرت و فـێڵ و کەمو کوڕییـەکانی هەڵبژاردنەکە بگرێت بۆیە نابێت بەرهەڵسـتی لێ بـکرێت". بەڵام دیـار بـوو کـــە ئـەمـــە پیـــلانێـک بـوو لە لایەن تـارانـەوە رێکخرابـوو، لە پێشـەوە لەگـەڵ چەند ئەندامێکی وەزارەتی تەورێزدا رێک کـەتبـوون بۆ تێکدانی کۆمـارەکـە. لەوەڵامی برووسکەکەی تاران، جـەعـفـەر پیشەوەری نووسیبوی!.

"بەگـــوێرەی ئەو پەیمانەی کـــە لەســـەری رێک کـــەوتووین، لە شکری ئازەربـایجـان بە لـە شکری ئێـران دادەنرێت، بۆیە پێـویست بە ناردنی لە

شکری ئێران ناکات بۆ چاودێری کردنی هەڵبژاردنی پەرلەمانی نوێ، لە شکری ئازەربایجان دەتوانێت بێ هیچ لایەنگیری کردنێک سەرپەرشتی ئەو هەڵبژاردنەی نێو خۆی بکات".

بەڵام لە راستیدا تاران هیچ گوێی نەدایە وەڵامەکەی جەعفەر پیشەوەری، چونکە خیانەتکارانی وەزارەتی تەورێز هەموو شتێکیان لەگەڵ تاراندا براندبۆوە کە بە هاتنی لە شکری ئێران دەست بەسەر کۆمار دا بگرن.

کۆماری تەورێز چەک و تەقەمەنیەکی زۆر باشی هەبوو، بەڵام دەستی خیانەتکاری نێو خۆیان ئەو دەرفەتەی لە دەست دان، کە سوود لەو چەکانە وەربگرن، شایانی باسە کە کۆماری مەهاباد لە رێگەی ئەوانەوە ئازووقە و چەک و تەقەمەنی بۆ دەهات. کاتێک کە لە شکری ئێران بەرەو تەورێز چوو هیچ جۆرە بەرەنگاری و بەرهەڵستیەکی پێویستی بەرامبەر نەکرا.

لە ئەنجامدا جەعفەر پیشەوەری و ژەنراڵ غولام یەحیا لەگەڵ (١٥٠٠) سەربازدا بەرەو رووسیا هەڵاتن و خیانەتکارە خۆفرۆشەکانیش دەستیان بەسەر تەورێزدا گرت.

سەرهەنگ عەزیمی کە هیچ ئاگای لەو فرت و فێڵ و پیلانانە نەبوو، ئەو دەمە لەورمێ دەبێت کە دەگەرێتەوە بۆ تەورێز دەیگرن و لە سێدارەی دەدەن.

## نامەی پێشەوا و چوونم بۆ مەهاباد

ئەو دەمـە من لە رەبەت بووم و خـەریکی کـاروباری سـەربازەکـانم بووم، سـاڵ بەرەو تەواوبوونیش دەچوو، نامـەیەکم لە پێشـەواوە بۆ هات، لەوێدا فەرمووبووی:

"تەورێز خیانەتی لێ کرا، جەعفەر پیشەوەری و غولام یەحیا رۆیشتن بۆ رووسیـا. پێـوەندی لەگـەڵ دوژمـن ببـڕە، یەکـێک لە جـێی خـۆت دابنێ و خۆشت بەرەو مەهاباد بگەڕێوە تا چارەیەکی وەزعی خۆمان بکەین".

کە ئەو نامـەیەم بەدەست گەیشت کات ئێوارە بوو، دەست بەجێ فەرمـانم دا کـە ئەو ئازووقـە و خـواردمـەنییەی هەمـان بوو بەسـەر دانیـشـتـوانیدا، دابەش بکەین. زێڕۆ بەگم کردە جێنیشنی خۆم و فەرمانم دایە کە بۆ رۆژی دوایی هێزەکەمان بەرەو مەهاباد بکشـێتـەوە، خۆشم لەگەڵ دوو سەربازدا بەرەو مەهاباد کەوتمە رێ و نیوە شەو گەیشتینە گوندی (خەراجە) لە دۆڵی زمزیران.

ماشینێک کە ئەو رۆژە بە بارەوە ناردبووم بۆ مەهاباد لەوێ مابۆوەو برای خێزانەکەشم ئەسعەد حاجی حەمەد ئاغاشی تێدابوو، ئەویشم لەگەڵ خۆم هەڵگرت. بۆ بەیانییەکەی گەیشتمەوە ماڵێ لەمەهاباد. لەوێ دیتم ساڵەح عەبدولعەزیز لەگەڵ (٥) بارزانی دیکە کە مەلا مستەفا بە ئێشکچی لە مـاڵمـانی دانابوون، مـاڵیـان گـشت پێـچـاوەتەوە و چاوەڕوانی من دەکـەن. مەلا مستەفا لە ماڵی جەعفەری کەریم ئاغا بوو، کە دونیا تەواو رووناک بۆوە رۆیشتم بۆ لای لە نیزیک ماڵمان تووشی هاتم ئەویش هەر بەرەو لای ئێمە دەهات، پێکەوە گەڕاینەوە ماڵێ و پاش کەمێک دانیشتن بڕیارمان دا بچینە دیدەنی پێشەوا. ماڵی ئێمە و ماڵی پێشەوا لێک نزیک بوون و لەسـەر هەمـان شەقام بوون، کە چووینە دەرێ پێشـەوای بەڕێزمان لەسـەر شەقامەکە دیت و چووینە پێشوازی ماندووبوونی لێ کردم و فەرمووی کە چاک بوو گەیشتمە جێ.

## دووا وتوێژی نێوان پێشەوا و مەلا مستەفا

هەر لەبەر دەرگاکەی سەر جادەکە، مەلا مستەفا چووە پێشی بەرێز پێشەوا و فەرمووی: "حەزرەتی پێشەوای فەرماندە - تکام ئەوەیە کە لەگەڵمان لە مەهاباد دەربچیت. ئەگەر بەتەنێ بمێنم حەوت ساڵ ئاڵاکەت لەسەر سەرم هەڵدەگرم، مانەوەت لێرە مەترسی لە دوایە. حکومەتی ئێران لە سێدارەت دەدات". پێشەوا فەرمووی: "مەلا مستەفا لە هەموو سەردەمێکدا سەلماندووتە کە تۆ دڵسۆز و کۆڵنەدەری نیشتمان پەروەر و خەباتگێڕی، مەرد و وەفاداری، چاک دەزانم کە حکومەتی ئێران لە سێدارەم دەدات، بەڵام من لە خۆشیدا لەگەڵ خەڵکی مەهابادا بووم، ئەوا لە ناخۆشیدا بەجێیان ناهێڵم. مردن و ژیانم لەگەڵ ئەوان دایە، گەر ئێستە بەجێیان بێڵم عەشیرەتەکانی مەهاباد بەردبارانمان دەکەن. بە کوشتنی خۆم رازیم نەوەک مەهاباد بە وێرانی ببینم، فەرموو با بچین بۆ خانەقای نەهرێ (مزگەوتی "هەباس ئاغا")، ئەگەر میللەت بیروڕای وابوو کە جێیان بهێڵم، ئەوا مانعم نیە، ئەگەر نا دەمێنمەوە تا لە شکری ئێران دێتە ناو مەهابادەوە".

پاشان رووی لە من کرد و فەرمووی: "ماشێنەکەی منیش بەرن و سوودی لێ وەربگرن". پێم ووت کە حەزرەتی فەرماندە دەبێت لێم ببوورن، چاوم بەرایی نادات کە ماشێنی پێشەوا بەکار بێنم، تکام وایە ئەو داوایەم لێ نەکەن و بۆ خۆت بیسووتێنە. ئەگەر بە پێ بڕۆم ئەوا ماشێنی پێشەوا بە کار ناهێنم.

کە چووینە خانەقای نەهرێ، خەڵکێکی زۆری مەهاباد لەوێ بوون و تکایان لەمەلا مستەفا کرد کە شەڕ نەخاتە ناو مەهاباد و بەڵێنیشیان نەدا کە پێشەوا لەگەڵمان بێت بەو هومێدەی کە حکومەتی ئێران دەیبەخشێ.

دراوسێکەی ئێمە (سەمەدۆڤ)، کە نوێنەری سۆڤێت بوو لەمەهاباد ڕۆژی پێشووتر هەڵاتبوو، تەنانەت جیهازی بێ تەلەکەشی (لاسلکی) لێ بەجێ مابوو، هەروەها مستەفا خۆشناو و ئەنوەر دڵسۆز و خانەوادەکانیان چووبوون بۆ ورمێ و بەو نیازەی لەوێوە بچنە رووسیا.

## چوونم بۆ نەغەدە

کە لە مزگەوت گەڕاینەوە، مەلا مستەفا فەرمووی: "بیستوومە کە لە نەغەدە قەرەپەپاخ ڕێ بەو ماڵانە دەگرن کە بۆ شنۆ دەچن و رووتیان دەکەنەوە، بگەرە ئەوێ و دەست بەسەر نێوچەکانی نەغەدە و شنۆ دا بگرە، و رێ خۆش بکە بۆ کشانەوەی ئەو هێز و ماڵە بارزانییانەی کە روو لەوێ دەکەن. هەروەها فەرمووی: کاکم (محەمەد سەدیق) لە شنۆیە و هێزێکی لەگەڵدایە و ئاگاداری یەکدی بن، منیش لێرە دەمێنم و چاوەڕوانی ئەو هێزەی کاک عێزەت عەبدولعەزیز دەکەم کە لە ساین قەڵایە و بۆ یارمەتی دانی هێزی ئازەربایجان چووە تا دەگەڕێنەوە".

پاش ئەوەی من بە ماڵەوە بەرەو شنۆ چووم. لە رێگەی شنۆ کە لەگەڵ رێگەی نەغەدە لێک دەداتەوە، هەر لە دوورەوە خەڵکێکی زۆری قەرەباڵخ بەرەو ئەو دووڕییانە دەهات، چەند دەستڕێژێکمان بەسەردا کردن و بڵاوەیان لێ کرد.

چووینە شنۆ، لەوێش زانیم کە شێخ محەمەد سەدیق و حەمەد ئاغای مێرگەسووری بەرەو نەغەدە رۆیشتوون. رۆژی دواتر منیش چووم بۆ لایان.

کە کاک عێزەت عەبدولعەزیز و هێزەکەی گەڕابونەوە مەهاباد، لەوێوە لەگەڵ مەلا مستەفا چووبوونە دەرێ و لە گوندی مەحمەشە کە دەکەوێتە نێوان مەهاباد و نەغەدە مابوونەوە.

## ڕۆیشتنی مەلا مستەفا بۆ تاران

پاش ئەوەی کە شێخ محەمەد سەدیق لە نەغەدە جێگیر بوو، منیش چوومە نەغەدە، سێ ڕۆژێک تێپەڕی کردبوو، نامەیەکم لەمەلا مستەفاوە بەدەست گەیشت، کە تێیدا دەیفەرموو:

"وا من و کاک عیزەت و کاک میرحاج و کاک نوری ئەحمەد طە دەڕۆین بۆ تاران، تۆش لەگەڵ کاکم شێخ ئەحمەد چیتان بە بەرژەوەندی زانی بیکەن، ئێمە دەچین بۆ ڕێگەی هات و نەهات".

منیش دەست بەجێ (شفرەیەکی ئاسانم) لە چەند پیتێک دروست کرد، کە هەر پیتەی مانایەکی تایبەتی، پێچەوانەی مانا ئاساییەکەی خۆی دەدا، ئەم شفرەیەم لەگەڵ نامەیەکدا بۆ نارد و بۆم نووسیبوو گەر هاتوو لە تارانەوە نامەی نارد ئەوا بەپێی ئەم پیتانە بینووسێ کە بە چەشنی نامەی ئاسایی، وەک نامەی دوو کەس، دەنووسرێت. هەڵبەتە کە ئێمە مانایەکی تایبەت و جیاوازمان لە مانا ئەسڵی‌یەکەی خۆی دانابوو.

پاش چوونی مەلا مستەفا بۆ تاران، گشت ئەو بارزانی و خەڵکانەی کە لەگەڵیدا بوون لە شنۆ و نەغەدە کۆبوونەوە و لەسەر فەرمانی شێخ ئەحمەد ماڵە بارزانی‌یەکانم بەسەر گوندەکانی نێوچەی لاجان، شنۆ، نەغەدە... دابەش کرد. هەروەها بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو بارزانی و خەڵکە ئاوارەیە، شێخ ئەحمەد کردمیە جێگری خۆی.

هێزی ئێرانی تا گوندی مەحمەشە هات و زێتر نەترازا، بەرامبەر بەو هێزەی ئەوان ئێمەش هێزێکی بارزانی کە (٥٠٠) چەکدار بوون، لە نەغەدە و دەوروبەرەکەیان دامەزراند و جێی خۆیان قایم کرد. هەروەها داوامان لە ئاغاکانی قەرەپەپاخ کرد لە نەغەدە کە دەستەبەری (تأمین) ئازوقەی ئەو هێزە و ئەو خەڵکەش بکەن کە لەوێن، بۆ ئەوەی کە دوژمن وا هەست پێ بکات و تێبگات کە چەکدارێکی زۆرمان لەوێ و لە نێوچەکانی

دیکە هەیە، وام بە پێـویست زانی کـە شـەوانە لەو هێـزەی نێـو نەغـەدە (١٠٠-١٥٠) چەکدارێک بە نهێنی بنێرمە گوندێکی دەرەوەی نەغەدە و سەر لە نوێ داوامـان لە جێگری قۆڵی خـان و پاشا خانی نەغـەدە کرد کە مـەسـەلەی ئازوقـەی ئەو چەکـدارە نوێیـانەش (١٠٠-١٥٠) دابین بکەن. چونکە ئەوەم بـاش دەزانی کــە رۆژانە هەواڵی ژمــارەی چەکــدارەکــانمان دەگەیێنرێتە لە شکری ئیران و جاسووسیـمان لەسەر دەکرێت. بۆیە منیش وام پیشـان دەدا کە هێـزێکی گەلێک گەورەمان لە نەغـەدە هەیە تا دوژمن ورەی نەمــێنێ و پەلامــارمـان نەدات. هەروەها ژمـارەیەکـیش چەکـدار و مـاڵمـان ناردە گـوندی کـانی سپی کـە سـەر بە فـەتاح ئاغـای هەرکی بوو (پیاوێکی نان بدەو دەوڵەمەند و باش بوو، و لەگەڵماندا دۆست بوو).

شێخ محەمەد و سەدیق و حەمەد ئاغاش کرانە لێپرسراوی نەغەدە، هەر لەو دەمـەشدا سـەردانێکی نێوچەی لاجانم کـرد بۆ دیدەنی ئەو بارزانییانەی کـە لە شینـاوێ، زەرگەتەن، خرابە، سـەروکانی، پەسوێ، سیـلۆێ، خانێ و دێهـاتـەکـانی دی دامـەزرابوون. ئەمـانەش لە لایەن: حـەمـەد ئەمین ئاغـای پیران، قـەرەنی ئاغـای مـامـەش، کـاک مـامەندی مـامـەش، حـەمـەد ئاغـای سـەروکانی و عـەشیـرەتەکانیان پاڵپشـتی و یارمـەتی ژیانیان دەکرا و پاش سەردانەکە گەڕامەوە شنۆ.

بەر لە ئێسـتە ووتمان کە لە ڕۆژی تێک چوونی کۆماری مەهاباد دا کـاک مـسـتـەفـا خـۆشناو و کـاکـە ئەنوەر دڵسـۆز بەرەو ورمـێ رۆیشـتـبـوون، بەو نیـازەی کە بچنە رووسیـا. لە رۆژێکی سـەرمـا و سۆڵ و سـەهۆڵبـەندانێکی زۆردا لەماڵەوە دانیشـتبـووین (ماڵەکەمان بریتی بوو لە ژوورێک لە نهۆمی ژێرەوە و ژوورێکی گچکەش لە نهۆمی سـەرەوە، بەشی دووەمی خانـوەکەش خـودی مـاڵەکـەی تێـدا دەژیا)، ئەو کـاتـەش خـێـزانـەکـەم و براکـەی تووشی نەخـۆشی تیـفـۆ هاتبـوون و حـاڵیـان گـەلێک پەرێشـان بـوو، ژمـارەیەک لە برادەرانیشـمـان، وەهاب ئاغـا، جەلال ئەمین، عـەبدولرەحمـان تەیبب و هی دیکەشـمـان لا بوون و هەمـوو لە دەوروبەری زۆپاکـە، کـە بە دڕکـە گـوێنی

دامـان گـیـرسـاندبـوو، دانیـشـتـبـووین. ناو بەناویش دەچوومـە ژوورەکـەی خوارەوە بۆ سەردانی نەخۆشەکانم تا بزانم کامەیان مردوون و دەگەڕامەوە لای برادەران. زۆر بە داماوی لەو ژوورەدا دەژیاین و بەردەوامیش وتوێژمان لەسـەر ئەو بارودۆخـە نالەبارە دەکـرد. دەردی دڵی خـۆمـان هەڵدەڕشت کـە یەک لە برادەران ووتی: بەخوا هەر کاک مـسـتـەفـا و کـاک ئەنوەر چاکـیـان کرد، ئێستە بۆ خۆیان گەیشتوونەتە رووسیا و حەساونەتەوە.

زۆر بەسـەر ئەم قـسـەیەدا تێنەپەڕی، دیتم یەکـێـک خـۆی بە حـەوشی مـاڵەکـەدا کـرد و سـەری وڵاغـێـک رادەکـێـشێ. پەنجـەرەی ژوورەکـە هێندە تەماوی بوو کە تەماشامـان کرد نەماننـاسی‌یەوە و کە چووینە پێشـوازی‌یان دەبینین کـاک ئەنوەر دڵسـۆز و خـێـزانەکـەیەتی. لەسـەرمـان قـسـەیان پێ نەدەکـرا، دوای چەند دەقـیـقـەیەک خـۆ گـەرم کـردنەوە، ئینجـا کـاک ئەنوەر زمانی کرایەوە و پێمان ووت کە ئەمڕۆ باسی ئێوەمان دەکرد کە چاکتان کرد خـۆتان رزگـار کـرد و بەرەو رووسـیـا چوون کـەچی لێـرە دەتان بینین. ئەوجـا کاک ئەنوەر بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاینەوە و ووتی: "کـاتێک کە لەگەڵ کاک مـسـتـەفـا و خێزانەکانمان چوینە ورمێ، لەوێشـەوە بە نیـازی باکـۆ کەوتینە رێ، تا نیـزیـکی عـەشـیـرەتێک بووینەوە بە نێـوی "کـۆرە سـوننی" (کـوێرە سـوننی). لەوێ گـەلێـک مـەترسـیـمـان لێ نیـشت کـەمان گرن و بماندەنەوە دەست حکومەتی ئیران، لەبەر ئەوە ناچار گەڕاینەوە و چووین بۆ مەرگەوەڕ لای سـەید عـەبدوڵلا ئەفـەندی نەهری مـاینەوە، ئەم نامـەیەشی بۆت نووسـیـوە". نامـەکەم خـوێندەوە، نووسـوبـووی "دەربازی رووسـیـا نەبووە و گەڕاوەتەوە مەرگەوەڕ، ئێستەش دەیەوێ تکای بەخشینی لای شێخ ئەحمەد بۆ بکەم".

وەک لەمەو پێش باسمان کرد کە شێخ ئەحمەد گەلێک لە کاک مستەفا بە گلەیی بوو، هەمان گلەییشی لە کاک ئەنوەر هەبوو، پێش ئەوەی ئێوارە دابێت چوومـە خزمـەت شێخ ئەحـمـەد و مەسـەلەی کـاک مـسـتـەفـا و کـاک ئەنوەرم لەگەڵ کردەوە. پێم ووت کاک ئەنوەر و خێزانەکەی لە ماڵی ئێمەن

و کـاک مــســتــەفــاش لە مـاڵی ســەید عــەبدوڵڵا ئەفـەندی نەهری‌یە لە مەرگەوەڕ. شێخ ئەحمەد هەمان گلەیی جارانی سەبارەت بە هەڵسوکەوتی مستەفا خۆشناو بەرامبەر بە بارزانی‌یەکان جەخت کردەوە. لەوەڵامدا ئەو راستـیەم پێشکەش بە شێخ کرد کە مسـتەفا خۆشناو وەک ئەفسـەرێک قـوربانی گـەلێک داوە و چووەتە ریزی بارزانی‌یەکـان و خزمـەتێکی زۆری کردووە. ئێستـاش لەو هەڵوێسـتانەی پێشـووی پەشیـمانە و هەر بۆیەش داوای بەخشینتان لێ دەکات، خۆ ئەگەر نا ئەویش پێی خۆشە وەک ئێمە و ئەفسـەرەکانی دیکە کە لەگەڵتانین بمایەتەوە. ئەوجا لێبوردنیش بۆ ئەو کەسانەیە کە تاوانێکیان کردبێت.

پاشان شێخ فەرمووی: وا من لێی خۆش بووم هەر ئەولادی ئێمەیە، جا گەر دەیەوێ با منداڵەکانی بنێرێتەوە لای تۆ، بەڵام تا یەک دوو هەفتەیەک خۆی ئاشکرا نەکات تا هەمـوو بارزانی‌یەکان ئاگـادار دەکەم کە کەس رێی پێ نەگـرێت، ئەو دەمـە خـۆی سـەربەسـتـە کـە بێـتـەوە ئێـرە یاخـود لە هەر کـوێیـەک بەرژەوەندی بخوازێت منیش بەو چەشنە وەڵامی نامەکـەی کاکـە مستەفام دایەوە.

چوونەکەی مەلا مستەفا بۆ تاران چەند هەفتەیەکی بەسەر دا رۆیشتبوو، بێ ئەوەی هیچ هەواڵێکمان بە دەست بگات. کاتی خۆی کە کاک عێزەت عــەبدولعــەزیز لە سـاین قـەڵا بوو، چەند تۆپێکی لەو ئازەربایجـانیــانە سەندبوو کە ویستبوویان بگەڕێنەوە لای حکومەتی ئێران، و لەگەڵ خۆی هێنابوونی، منیش هەر لەو ماوەیەدا ژمارەیەک بارزانیم لەسەر دانابوون و مەشقم پێ دەکردن تا بە تەواوی فێری بەکارهێنانی ببوون، لە هەمان کاتا قـەناعـەتم بە جـەنابی شـێخ ئەحـمـەد کـرد کـە مـانەوەی ئەو خـەڵکە لەو نێوچەیەدا زۆری خایاند و لە توانای دانیشتـوانی نێوچەکەشدا نەماوە کە چیـدیکە ئەو خـەڵکە ئاوارە زۆرە بەخێـو بکەن و پێـویسـتـە وورده وورده خـۆمـان بگەیـەنینە نیـزیکتـرین نێـوچەی عـەشیـرەتی جـەلالیـان، هەروەها بەوەش قەناعـەتم پێ هێنا کە چارەیەکی دیکەشمـان نی‌یە جگە لەوەی کە

بچین بۆ رووسیا. بۆ ئەو مەبەستەش سێ کەسم نارده لای ژەنراڵ ئەتاکشیۆف لە تەوریز کە هەوڵی ئاسان کردنی هاتن و حەواندنەوەمان لەوێ بدات لەو سێ کەسەمان دوانیان لە لایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە بەند کران و ئەوی دیکەیان توانی خۆی رزگار بکات و بگاتەوە لامان. پێی راگەیاندین کە ژەنراڵ ئەتاکشیۆف دەڵێت: خۆمان بگەیەنینە لای جەلالیان و ئەو دەمە چوونمان بۆ سۆڤیێت رێک دەخات.

موسا خانی زەرەزا - سەرەک عەشیرەتی زەرەزا - لە شنۆ دادەنیشت، رۆژێک دەچێتە ورمێ و لە گەڕانەوەیدا وێنەیەکی کاریکاتۆری مەلا مستەفا و برادەرانی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە لەورمێ بڵاو کرابۆوە. لە وێنەکەدا دوو سەربازی ئێرانی نێزەی سەر تفەنگەکانیان بۆ لای برادەران درێژ کردووە و لە ژێرەوە نووسراوە کە ئەوانە زیندان کراون.

بەڕێز شێخ ئەحمەد ناردی بە شوێنمدا، کە چوومە لای دیتم گەلێک سەغڵەت و پەشۆکاوە، رووی تێکردم ووتی: "رەئیس بەکر، مەلا مستەفا چوو". واتە فەوتا. منیش دڵم دایەوە کە شتی وا نی‌یە، وێنەکەی پێشاندام. پێم ووت کە مەرج نی‌یە ئەوە راست بێت، پاشان کێ دەڵێ کە دەزگایەکی رەسمی ئەو وێنەیەی بڵاو کردبێتەوە، هەر چۆنێک بێت پێویستە ئێمە کارێکی وا بکەین کە بزانین چوونەکەی مەلا مستەفا ئەنجامی بە چ گەیشت.

دوای نەمانی کۆماری مەهاباد، لە شکری ئێرانی بەرامبەر ئەو نێوچانەی کە ئێمەی تێدابووین، واتە لە گوندی مەحمەشە پتر تێپەڕی نەکردبوو، هەروەها بۆشیان نەدەچووە سەر کە بەو زووانە شەڕمان لە دژ بەرپا بکەن.

جا سەبارەت بەو بارو دۆخە و چوونەکەی مەلا مستەفا بۆ تاران و نەبوونی هیچ وەڵامێک لێیانەوە، لەگەڵ شێخ ئەحمەد دا بڕیاری پلانێکی بەم جۆرەمان دا:

١- فێڵ کردن لە دوژمن، بە بڵاوکردنەوەی هەواڵێک کە دەڵێ:- من و کۆمەڵێک بارزانی بە سەرکردایەتی حەمەد ئاغای مێرگەسوور و

ئەسعەد خۆشەوی و ژمارەیەک چەکداری دیکەی نابارزانی لە شێخ ئەحمەد جیا بووینەتەوە.

٢- هێرش بردنە سەر مەهاباد و ئازادکردن و رزگارکردنی پێشەوا قازی محەمەد و بەندکراوەکانی دیکە.

٣- چوونی مەلا مستەفا بۆ تاران و پەنا بردنی بۆ دوژمن، بێ پرسی ئێمەیە. بۆیە لەوەو دوا بە سەرکردەی خۆمان نازانین.

٤- رازی نەبوونی شێخ ئەحمەد لەو هەڵوێستە و کەرت بوونی هێزەکانمان. لە هەمان کاتدا شێخ ئەحمەد پێوەندی لەگەڵ تاراندا بکات و دڵنیایان بکات لەوەی کە نایەوێت شەڕ دژی حکومەتی ئێران بکات و لەو جووڵانەوەیەی ئێمەش بەر پرسیار نیە کە حکومەتی ئێران چمان بەسەر دێنێت.

هەروەها پلانی بزووتنەوەکەمان وا بوو کە چەند چەکدارێکمان بەر لە دوژمن بگرن لەمەحمەشە و تەقەیەکی زۆریان لێ بکرێت، چەکدارێکی زۆری دیکەشمان بەرەو ورمێ بچێت و داگیری بکات، چونکە ئەو کاتەش هێزێکی وای دوژمن نەهاتبووە ورمێ وە، جگە لە (٢٠٠) ژەندرمە نەبێت ئەمانەش بەر لەوەی ورمێ دوژمن بیگرێت بێ چەک بوون خۆیان ئامادەی ئەو رۆژە کردبوو کە هەر بە رووخاندنی حکومەتی تەوریز جل و بەرگی ژەندرمەیی بپۆشن و خۆ چەکدار بکەن و لەورمێ دابمەزرێن.

بڵاو کردنەوەی ئەم پلانە کارێکی راستەوخۆو یەکجار زۆری کردبووە سەر دەسەڵاتدارانی تاران. ئەم هەڵوێستەی ئێمەیان بە راست دەزانی و داوایان لێ کردین کە شەڕ لە نێوانمان دروست نەبێت. ئەوجا شا پێشوازی مەلا مستەفای کرد و گەلێکی رێز لێگرت و داواشی کردبوو کە بگەڕێتەوە نێو بارزانییەکان و نێوچەکە هێور بکاتەوە.

## گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ شنۆ

ئەو کاتەی کە ئێمە کەوتینە جموجۆڵ و گواستنەوەی چەکدارەکانمان بۆ لای نەغەدە و پەسوێ و سەر ڕێگەی ورمێ – مەهاباد، وامان پێشاندا کە لە کاتی دیاریکراودا هێرشی سەر لە شکری ئێران دەکەین و ئامانجیشمان گرتنەوەی مەهابادە.

ڕۆژێک لە ناکاو دا تەلیفۆنێک لەمەهابادەوە بۆ شنۆ کرا و ئاگاداریان کردین کە مەلا مستەفا لەوێیە و دەیەوێ لەگەڵ شێخ ئەحمەد دا قسە بکات. وەڵاممان دانەوە کە شێخ ئەحمەد ئامادە نی‌یە قسەی لەگەڵدا بکات. دوایی داوا کرا کە من لە بری ئەو قسە بکەم، منیش ئامادەیی خۆم پێشان نەدا، ڕاستی‌یەکەی ئەو کاتەش دڵنیا نەبووین کە حکومەتی ئێران ڕێگای گەڕانەوەی مەلا مستەفا دەدا یان نا، هەر بۆیە وامان بە چاک زانی ئێرانی‌یەکان وا هەست بکەن کە ئێمە لە مەلا مستەفا زویرین.

یەک دوو ڕۆژ خۆمان ڕاگرت و لەمەهابادەوە سەرلەشکر تەلیفۆنی کردەوە و داوای کرد کە ڕێ بە نوێنەرەکەیان سەرهەنگ غەفاری بدەین، لەگەڵ مەلا مستەفا و دکتورێک دا بێنە شنۆ بۆ وتوێژکردن لەگەڵ جەنابی شێخ ئەحمەد دا. ئێمەش کاک عەبدولڕەحمان تەییمان نارد بۆ مەهاباد و پێکڕا هاتنەوە شنۆ.

بە گەیشتنیان پێشوازیم لێ کردن و سەرهەنگ غەفاری و دوکتۆرەکەیم گەیاندە جێی خۆیان (خانویەکمان بۆ تەرخان کردبوون). شەش بارزانیشم بۆ پاراستنیان دانا و ڕام سپاردن کە هیچ کەسێک جگە لە خۆم بۆی نی‌یە پێوەندی لەگەڵدا بکات و هەر کارێکیش هەبوو ئێوە بۆیان جێ بەجێ دەکەن.

لەگەڵ سەرهەنگ دانیشتبووم و باسی هەندێک شتی ئاساییمان دەکرد، بارزانی‌یەک هات و ئاگاداری کردم کە خێزانەکەم پەرێشانە و بە پەلە

بگەمە ماڵەوە. سەرهەنگ داوای لێ کردم کە ئەو دکتۆرەی لەگەڵیدا بوو لەگەڵ خۆمی ببەم، بەڵام پێم گوت کە سەرەتا دەبێ بچمەوە و ئەگەر مابێت ئەوا دکتۆر دەبەم بۆ تەماشاکردنی. کە لای سەرهەنگ چوومە دەرەوە، بارزانی‌یەکە ووتی: خودان و مەلا مستەفا لەماڵی خودانن و چاوەڕێت دەکەن.

چوومە ماڵێ خودان، دوای بەخێر هاتنەوەی مەلا مستەفا و کاک عێزەت و ئەوانی دیکە، کۆڕێکمان ئامادە کرد کە لەوێدا کاک مامەندی کولیجی، موسا خانی زەرەزا، حەمەد ئاغای مێرگەسوور، کاک عێزەت، میرحاج و ئەسعەد خۆشەوی ئامادە بوون. جەنابی شێخ رووی کردە مەلا مستەفا و فەرمووی: بێژە چتان کرد و شا چ دەڵێت. لەوەڵامدا مەلا مستەفا فەرمووی کە سێ رێگەیان بۆ داناوین:

١- لەماوەی ١٥ رۆژ دا ئێران جێ بێلێن. چەکی قورسی وەک تۆپ و رەشاش بدرێتەوە ئێران، لەو ماوەیەدا تا دەگەینەوە سنووری عێراق حکومەتی ئێران ئازووقەمان بۆ دابین دەکات.

٢- گەر نەچینەوە عێراق، ئەوا حکومەتی شا ئامادەیە کە لە نێوچەی مازندەران وەک پەنابەر وەربگیرێین. ئەو ئەفسەر و موچەخۆرانەی لە سوپای ئێران و دەزگا دەوڵەتیەکاندا دەست بە کار بن، بێگومان ئەو دەمە چەکەکان دەبێ بە ئێران بدرێنەوە.

٣- ئەو کەسانەی ئێمە کە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە حوکمی لە سێدارەدانیان لەسەر دراوە، وەک پەنابەری سیاسی لە ئێران قەبووڵ دەکرێن، ئەوانی دیکە بگەڕێنەوە عێراق و حکومەتی شا، گەرەنتی بەخشینیان لە حکومەتی عێراق بۆ وەردەگرێت.

پاش ئەم روونکردنەوە و هەواڵ گەیاندنە، شێخ ئەحمەد رووی لەمەلا مستەفا کردەوە و فەرمووی: بێژە بڕیاری تۆ چییە؟ لەوەڵامدا مەلا مستەفا فەرمووی کە هیچ بیروڕایەکی لەو بارەوە نی‌یە و خودان چ فەرمانێک

دەدات و چی بە باش دەزانێت قەبوڵە.

لە کۆڕەکەدا وا ڕێک کەوتبوو کە من لە تەنیشت و دەستە ڕاستی شێخ ئەحمەدەوە دانیشتبووم، ڕووی تێ کردم و فەرمووی:

"بەکر تۆ بێژە لە ڤ شەرتانە کامیان قەبووڵ کەین". لە وەڵامدا پێم ووتن کە هەر کامێک لەو مەرجانە قەبووڵ بکەین مانای فەوتاندنی خۆمانە، ئەویش لەبەر ئەو هۆیانە:

١- گەڕانەوەمان بۆ عێراق لە تواناد نییە و مەحاڵە، جگە لەوەی کە ژن و منداڵێکی زۆرمان لەگەڵدایە و بێ خۆراک و ئازووقە، پەرێشانین لە هەمان کاتدا شەڕیشمان پێ ناکرێت، چونکە بەگەڕانەوەمان ئێران سنووری خۆی دەگرێت ئەمە جگە لەوەی کە لەو لاشمانەوە تورکیا هەر دوژمنە، واتە دەکەوینە نێوان ئەو سێ حکومەتە و ئەوانیش بەردەوام لە پێوەندی دان بۆ نەهێشتن و قڕکردنی ئێمە.

٢- مانەوەمان لە ئێران و تەسلیم کردنی چەکەکانمان، دەمانخاتە دۆخێکی واوە کە هەتا هەتایە بە ئێرانەوە گرێ بدرێین و جارێکی دیکە و سەر لە نوێ نەتوانین ڕاپەڕین.

٣- بەرەڵلا کردن و ڕێگەدان بەو عەشیرەتانەی لەگەڵمان دان بۆ عێراق مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت کە لەوێ بکەونە بن دەست و ڕەحمەتی ئەو عەشیرەتانەی کە دوژمنیانن، ئەوجا بەوان و بەحکومەتی عێراق لە نێویان دەبەن. لەبەر ئەوە من پێم وایە کە هیچ ڕێگەیەکی دیکە نی‌یە جگە لەوەی کە هەوڵ بدەین خۆ بگەیەنینە سەر سنووری رووسیا (سۆڤێت) و لە کاتی پێویستدا دەتوانین بچینە نێو خاکی ئەوانەوە.

لەم بارەشەوە من پێم وایە کە بەم چەشنە بکەین باشە:

١- ئاگاداری حکومەتی ئێران بکەین کە بە مەرجی یەکەمیان ئامادەین، بەڵام گەڕانەوەمان دووا بخرێت بۆ کاتێک کە ئاو و هەوا و وەرز خۆش دەبێت، چونکە ئێستە بەفرو باران و سەرمایە و ناتوانین لە چیاو

دۆڵەکانی سەر سنوور بحەوێینەوە، جگە لەوە ئەو چەکە قورسانەی کە پێمانە نایان درێتەوە، چونکە ئەو چەکەمان پێ نەبێت ئەوا شەڕمان دژ بە حکومەتی عێراق پێ ناکرێت، ئەمە جگە لەوەی کە ئێران بەڵێنی داوە چەکی دیکەشمان بداتێ.

٢- حکومەتی ئێران ڕێگەمان بدات کە بچینە ناوچەکانی تەرگەوەڕو مەرگەوەڕەوە، چونکە ماوەیەکی زۆرە بووینەتە ئەرک بەسەر دانیشتوانی نێوچەکانی نەغەدە و شنۆ و لاجان و ئەو خەڵکەش لەوە زێتر توانای یارمەتیدانی ئێمەیان نەماوە. هەروەها پاش تواندنەوەی بەفر و خۆش بوونی ئاو و هەوا لە ڕێگەی "کانی ڕەش"ەوە کە نێزیکترین ڕێگەیە بۆ بارزان دەگەڕێینەوە.

گەر ئێران بەو دوو داوایەمان رازی بێت، ئەوا چوونمان بۆ مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ زۆر لە نێوچەی (جەلالیان)مان نیزیک دەکاتەوە و ئەمانە دۆستمانن و یارمەتیمان دەدەن و نیزیک سنووری سۆڤیەتیشە، ئەو دەمە بە ٢-٣ رۆژ لە تەرگەوەڕەوە دەگەینە جێگەی پێویست. هەروەها بەر لە ئێستاش ژەنراڵ ئەتاکشیۆڤ ئەو پێشنیازەی بۆ کردین کە بچینە نێوچەی جەلالیان.

بە پێچەوانەی ئەمەوە گەر ئێمە هەر سوور بین لەسەر مانەوەمان لێرە، ئەوا ئێران دەتوانێت پەلامارمان بدات و لە هەموو لایەکیشەوە ئابلۆقە بدرێین و خۆشمان پێ رزگار ناکرێت. لەبەر ئەوە من پێم وایە کە هەر لە ئێستەوە بەدواوە بە ڕێگەیەکی ئاشتیانە هەوڵ بدەین قەناعەت بە ئێران بکەین کە ڕێی چوونە نێوچەی جەلالیانمان بۆ خۆش بکرێت.

پاشان جەنابی شێخ ئەحمەد رووی لە کاک عێزەت عەبدولعەزیز کرد و پرسی کە بیرورای چییە؟ وەڵامی دایەوە کە ئەویش هەمان بیرورای منی هەیە. هەروەها مەلا مستەفا و ئەوانی دیکەش بیرورایان وا بوو کە لەمە

زێتر هیچ چارێکی دیکە نی‌یە. پاش ئەوەی کە هەموویان بڕیاریان لەسەر بیروڕاکانی من دا، ئەوجا شێخ ئەحمەد فەرمووی: رەئیس بەکر تۆ نوێنەرمان بە و لەگەڵ سەرهەنگ غەفاری دابنیشە و لەسەر ئەم بیروڕایانە رێک بکەوە.

## وتوویژی نێوان من و سەرهەنگ غەفاری

سەرهەنگ غەفاری زمانی عەرەبی گەلێک باش دەزانی و زۆر بە چاکی قسەی پێ دەکرد. بێ گومان لەسەرەتادا غەفاری وای پیشان دەدا کە زۆر بە پەرۆشە بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کە ئێمەی تێدا دەژین! وە گوایا حکومەتی شاهەنشا زۆر بە سۆزە لەگەڵماندا و کورد و فارسیش ئارین و لە یەک رەچەڵەکن و شا بەچاوی بێگانە تەماشای کورد ناکات! بەڵکو کوردی ئێران و فارس بە چاوێک تەماشا دەکات و دەیەوێ یارمەتیتان بدات لەو کوێرەوەریەی کە تێیدا دەژین. تا رزگارتان دەبێت. گوایا خۆشی هەر بۆ ئەو مەبەستە هاتووە. ئەمە شانۆگەرییەکی بە ئەدەبان بوو لە لایەن سەرهەنگ غەفارییەوە... منیش پێم ووت: حکومەتی شا چی لە ئێمە دەوێت چۆن و بە چ جۆرێک دەیەوێ یارمەتیمان بدات و رزگارمان بکات؟ لە وەڵامدا ووتی کە شا سێ رێگەی داناوە کە ئەویش ئەمانەن: (ئەو سێ رێگەیەی کە سەرهەنگ غەفاری پێی راگەیاندم، هەمان ئەو سێ خاڵە بوو کە جەنابی مەلا مستەفا ئاگاداری کردین و پێشتر دەستمان بۆ راکێشا)...

منیش لەوەڵامدا پێم ووت:

١- ئێمە کە خاکی خۆمان لە عێراق جێ هێشتووە بۆ ئەوە نەهاتووینەتە ئێران تا حکومەتی تاران زەوی و زارمان بۆ کشتوکاڵ کردن، بەسەردا دابەش بکات و ببینە کرێکار، نەخێر. بەڵکو ئێمە بە بزوتنەوەیەکی نیشتمانی راپەڕیوین و داوای مافی خۆمان دەکەین. ئەوجا لە بری ئەوەی کە حکومەتی عێراق بە ئاشتیخوازانە لە داواکانمان بکۆڵێتەوە، زۆر بێ ویژدانانە پەلاماری داوین و شەڕێکی دڕندانەی دژمان بەرپا کردووە کە بە هەموو چەکێکی مرۆڤ قڕکەر بۆمبابارانی گوند و زەوی و زار و ژن و منداڵی بێ دەسەڵاتی کردووە. ئێمەش تا توانیومانە بەربەرەکانیمان کردووە و کە لە توانادا نەماین هاتووینەتە ئێران. لێرەش بە هەر فرتوفێڵ و هۆکارێک بێت کۆماری مەهابادتان لە نێو

برد. ئێستەش ئێمە هەر سوورین لەسەر داوای مافەکانمان تا مرۆڤێکیشمان مابێت خەباتی بۆ دەکەین.

٢- ئەوانەی کە حوکمی زیندان و لە سێدارەدانیان لەسەر دراوە، هەموو نیشتمان پەروەر و فەرماندە و رۆشنبیر و پێشڕەوی ئەم میللەتە ئاوارەیەن و خۆیان لەوان جیا ناکەنەوە تا لێرە بینە پەنابەر و میللەتەکەش بدەنە دەستی سەربڕ و بکوژ. لەبەر ئەوە لەمردن و ژیاندا هەموو لەگەڵ یەکترین.

٣- ئێمە ئومێدمان وا بوو کە حکومەتی شاهەنشا، پاڵپشتمان دەکات کە مافی خۆمان لە عێراقدا بستێنین. چونکە ئێران بەرژەوەندی لە عێراقدا زۆرە و بۆ ئێوەش باشە دۆستایەتی بکەن و کوردیش بە وەفایە و چاکەی هەرگیز لە بیر ناچێت. هەر چۆنێک بێت ئێمە واز لە مافی خۆمان ناهێنین. بۆ عێراقیش دەگەڕێینەوە بەڵام نەک لەماوەی ١٥ رۆژدا کە بۆتان داناوین، لێرەدا ئەو پرسیارە هەر لە خۆت دەکەم، ئایا تۆ وەک ئەفسەرێکی عەسکەری ئەو ماوەیەی کە بۆتان دەست نیشان کردووین بە راستی دەزانی، بە تایبەتی لەم کاتە سەرما و سۆڵەدا کە بەفر سنوورەکانی گرتووە و و ماڵ و منداڵێکی زۆریشمان لەگەڵ دایەو لە هەمان کاتیشدا شەڕی حکومەتی عێراقیش بکەین؟ لەبەر ئەوە تا ئاو و هەوا خۆش نەبێت و ریگەوبان نەکرێتەوە بۆ عێراق ناگەڕێینەوە. ئێمە وای بە پێویست دەزانین کە لە ئێران لە نێوچەیەکی نیزیک سنوور بمێنینەوە تا بتوانین لە کاتی خۆیدا ئێرە جێ بێڵین، هەروەها ئێمە ماوەیەکی زۆرە لێرە و لە نەغەدە و نێوچەکانی دیکەین و بووینەتە ئەرکێکی زۆر بە سەر دانیشتوانی ئەم نێوچانە و ئەوانیش چی دیکە یارمەتی ئێمەیان پێ نادرێت. جا ئەگەر حکومەتی ئێران ئامادەیی ئەوەی تێدایە کە پێویستی‌یەکانمان بۆ جێ بەجێ بکات ئەوا لێرە نابزوێین تا وەرز خۆش دەبێت، ئەو دەمە لە چ رێگەیەکەوە هاتووینەتە ئێران، بە هەمان رێگەدا دەگەڕێینەوە عێراق.

پاش ئەوەی کە بیروڕای خۆم پێش کەش کرد، غەفاری پرسی کە بۆچی لە ڕێگەی حاجی ئۆمەرانەوە ناگەڕێنەوە عێراق؟ پێم ووت:

١- عەشیرەتێکی زۆر لە ناوچەی حاجی هۆمەرانن و هەمووش دەبنە دوژمنمان.

٢- نێوچەکە گەلێک سەختە، گەر بەشەڕ بێین، ئەوا ئێمە وەک هێرش بەر زیانێکی کوشندەمان لێ دەکەوێت، چونکە ئەو جێیانە بۆ بەرگری کردن (دفاع) لە بارترن.

لەبەر ئەوە، گەر لە ڕێی "کانی ڕەش"ەوە بڕۆین، ئەوا بۆ ئێمە گەلێک لە بارترە چ لە رووی شارەزاییمان لە نێوچەکە و چ بۆ هێرش بردنە سەر دوژمن جا وای دەبینم تا ئەو کاتەی دەگەڕێینەوە لە نێوچەی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ بمێنینەوە.

سەبارەت بە تۆپەکانیش، ئەوا دەتوانین بتاندەینەوە لەبەر ئەوەی هیچ زەخیرەیەکی وای لەگەڵ نی‌یە کە کەڵکی هەبێت، بەڵام مەخابن کە ئێستە ناتوانین تۆپەکانتان بۆ بێنینەوە لەبەر ئەوەی بردومانەتە سەر سنووری عێراق و ئێستە بەفر ئەو ڕێیانەی گشت گرتووە، جگە لەمە دەبێت تۆپەکان هەڵبوەشێنرێن و پێویستیشمان بە زەیت و گریس هەیە تا چەور بکرێن و تا کاتی هێنانەوەیان بۆ ئێرە ژەنگدار نەبن (لە راستیدا تۆپەکان لە شنۆ بوون، و ئەو بەڵگانەشم بۆیە هێنایەوە تا وا تێنەگەن کە نایاندەینەوە. پێویستیشمان بە رۆن و زەیتی تۆپ هەبوو کە بمانبێت).

دەوروبەری چوار رۆژ لەگەڵ غەفاری دا لەوتوێژکردندا بووین و بە ئامانجێکی تەواو نەگەیشتین، لەو ماوەیەشدا بە پێی داوای سەرهەنگ، ماشینێک رۆن و زەیت بۆ تۆپەکانمان هات.

رۆژی پێنجەم چوومە لای سەرهەنگ تا مەسەلەکەمان کۆتایی پێ بێنین، بەڵام دیتم گەلێک پەشۆکاو و شڵەژاو و بێ ئارامە، پرسیم کە ئایا هیچ شتێک رووی داوە؟ لەوەڵامدا سوێندی خوارد کە هیچ شتێکی نەوتووە، تا

بەو جۆرە جەنابی شێخ ئەحمەد لێی تووڕە بووە و ویستوویەتی بیکوژێت. پێم ووت کە لە کوێ چاوی بە جەنابی شێخ کەوتووە؟ ووتی کە ئەمڕۆ بەیانی چووەتە دیدەنی. منیش هێندەی دیکەم ترساند کە بۆ بە منی نەوتووە تا مۆڵەتی سەردانی بۆ وەربگرم و پێشم ووت: هەر چاکیش بووە کە نەیان کوشتووی، پێدەچێ کە نیازێکی خراپت هەبووە و ئەوانیش گومانیان لێ کردووی، دووبارەی کردەوە کە هیچی نەکردووە، پێم ووت کە دەچمە لای شێخ تا بزانم لەسەر چی زویر بووە.

چوومە لای شێخ و لەو بارەوە پرسیارم لێ کرد، فەرمووی: "ئەم بەیانی‌یە، سەرهەنگ هاتووتە لام و پێم دەڵێت کە حکومەتی شاهەنشا هیچ جۆرە نیازی خراپکاری لەگەڵتاندا نی‌یە، بەڵام ئەو ئەفسەرانەی کە لەگەڵتاندان ئاژاوە لە نێواندا دروست دەکەن، چونکە نایانەوێ لە هێمنی دا بژین و هەمیشە حەز بە شەڕ دەکەن.

ئەوجا چەند رۆژە لەگەڵ سەروان بەکردا وتوویژ دەکەم و دەمانەوێ یارمەتیتان بدەین، بەڵام ئەوانەی کە ئەو داوایان دەکات (مەتالیبی تەعجیزین)و لە توانای ئێمەدا نی‌یە جێ بەجێیان بکەین، ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێ ئەو پێی نارازییە، لەبەر ئەوە هاتووم کە لەگەڵ ئێوەدا ئەو مەسەلەیە چارەسەر بکەم". جەنابی شێخ بەو قسانەی سەرهەنگ گەلێک تێکدەچی و پێی دەڵێت کە رەئیس بەکر نوێنەری ئێمەیە و هەرچی ئەو دەیڵێ قسەی ئێمەیە و بەر لەوەی کە دەری بکاتە دەرەوە ئەوەشی پێ دەڵێت کە حکومەتی ئێران زۆر غەدارە و هەمیشە بە فرت و فێڵ و پیلان گێڕان دەیەوێ ئێمە قەناعەت پێ بکات و لەو رووەوە رووسەکان گەلێک لە ئێران بە رۆمەت تر و چێ ترن.

چوومەوە لای سەرهەنگ و پێم ووت کە تۆ کارێکی گەلێک خراپت کردووە، چوویتە لای شێخ و بەو قسانە زویرت کردوە، لەگەڵ ئەوەشدا مەترسە و دڵنیا بە لەوەی کە ئێمەی کورد بە فرتو فێڵ و نامەردی خەڵک بانگ ناکەین و بیکوژین. ئەوە پیشەی ئێمە نی‌یە و ئێمە ئێوە نین، چونکە

لەمێـژووتاندا گەلێک خراپەکـاریتـان دژ بە گـەورە پیـاوانی کـورد کـردووە، وەک جەعفەر ئاغـا و سمکۆی شکاک و چەندانی دیکە، تەنانەت لەم چەند ڕۆژانەی پێشـوودا نوێنەرێکی ئێـمە (نانەوازادە)تان لە نێـو برد، گـوایا ئەو فڕۆکەیەی کە ئەوی تێدا بوو کەوتووەتە خوارێ و سووتـاوە. جا دڵنیـات دەکەمەوە کە تۆ لێرە بیت هیچ مەترسییەکت لەسەر نییە.

دیار بوو کـە مـەسـەلەی نێـوبردنی "رووسـەکـان" لـە لایەن شـێـخـەوە وەک کـێچـێـک کەوتبووە کەوڵی سەرهەنگ و ئارامی لێ بڕیبوو، بۆیە دەیپرسی کـە ئایا مـەبەسـتـی شـێـخ لـە باشی و بە ڕوومـەتی ڕووسـەکـان چی بوو؟ تێمگەیاند کە جەنابی شێخ مەبەستێکی لەو بارەیەوە نەبووە و بەم جۆرەم بۆ ڕوونکردەوە:

لە نێـو کوردەواریدا وا دەنگ ڕۆیشـتـووە کـە لە شەڕی جیـهـانی یەکەمدا ڕووسەکان میـاندواو و گەلێک نێـوچەی دیکەیان گرتووە و دانیشـتـووانیـان قـڕ کـردوون، کـە ئەم جـۆرە کـردەوانـە لەو دەمـەدا هەر لـەوان وەشـاوەتەوە و ئەمـەش بووەتە (نموونە). گـەر کـەسێـک گـەلێـک خـراپ و بێ مـروەت بێت پێـی دەڵێن:

لە رووس خـراپـتـری، ئەوجـا حکومـەتی ئێـرانیش بەم بەفـر و سـەرمـایە و دەیەوێ لێـرە دەرمـان بکـات، ئەمـە لە کـاتێکدا کـە ئێـمـە پەڕیدەین، لە بری ئەوەی کــە حکومــەتی شــا لەســەرمــان بە وەڵام بێت کــەچی بەم جــۆرە هەڵوێـسـتەی یارمـەتی دوژمنەکەمان دەدات، لەبەر ئەمـەیە کە جەنابی شێخ دەفەرمووێ رووسەکان لە ئێوە چاکترن.

هەر چەندە سـەرهەنگ وای پیـشـاندا کـە قـەناعـەتی بە قـسـەکـانم کـردوە، بەڵام لە ئـەنجـامـدا وا دەرکـەوت کـە ئێـمـە نیـازی چونە ڕووسـیـامـان هەیە. پاشان گەڕامەوە لای شێخ و پێم ووت کە سەرهەنگ بیروڕای باشی نیـە و هەمیشە خەیاڵ و بیرکردنەوەی لای قسەکانێتی.

## کێشەی نێوان ئێمەو ئاغایانی مامەش

ئەو خانووەی کە بۆ سەرهەنگمان دانابوو تێیدا بژی تەلەفۆنیشی تێدابوو. سانسۆرمان بەسەر هەموو قسەکردنێکەوە دانابوو، کە دەبێت بێ شفرە و بە ئاشکرا بێت، ڕۆژێک هەواڵێکمان بۆ هات کە ئاغایانی مامەش هەموویان لە گوندی پەسوێ کە جێی سەرەکیان بوو کۆبوونەتەوە و نیازیان باش نی‌یە. لەگەڵ حکومەتی ئێران ڕێک کەوتبوون کە ئەو بارزانی‌یانەی کە لە نێوچەی لاجان و دەوروپشتەکەین وەدەریان نێن، خۆ ئەگەر بە خۆشی خۆیان دەرنەچن، ئەوا بە زۆر و شەڕ ئەو کارە ئەنجام بدەن. مەلا مستەفا پێی ووتم کە بچمە گوندی شیناوێ و هێزێکی بارزانی لەگەڵ خۆمدا بۆ پەسوێ بەرم و پتر مەسەلەکەم بۆ روون بێتەوە. چوومە شیناوێ و ژمارەیەک بارزانیم لەگەڵ خۆم برد بۆ پەسوێ، لە ڕێگە بیستم کە مەلا مستەفا چووتە گوندی "سەروکانی"، لەوێ لامداو پرسیم کە بۆچی هاتووە؟

فەرمووی: "بیرم لەوە کردەوە کە نەک ئەو ئاغایانە لە پەسوێ خراپەکارییەک بکەن و تۆش دەستیان لێ بکەیتەوە و شەڕ لە نێواندا بەرپا بێت، بۆیە بە چاکم زانی کە لەو بارەوە ئامۆژگارییان پێ بدەم خۆ ئەگەر نا، خراپیان بەسەر دێت". پاشان بە مەلا مستەفام ووت کە دەچمە پەسوێ و ئەویش دووای کاتژمێرێک بگاتە ئەوێ.

لە پەسوێ بنکەیەکمان هەبوو کە (٢٠) چەکداری بارزانی لێ بوو، سەرەتا یەکێکم ناردە ئەوێ کە ئاگاداری بارزانی‌یەکان بکات، نیوەیان بچنە ماڵی حاجی قەرەنی ئاغا کە لەسەر بەرزاییەک بوو لە گوندەکەدا. حاجی قەرەنی ئاغا خۆی نەمابوو، عەزیز ئاغای کوڕی جێنشینی بوو، ئەویش لەوێ نەبوو چووبووە تاران و عەلێی قەرەنی ئاغا لەوێ بوو.

ئاغایانی مامەش هەواڵی چوونی مەلا مستەفایان بۆ "سەروکانی" پێ گەیشتبوو، تەنێ چەند چەکدارێکی کەمیان لە پەسوێ مابوو. کە گەیشتمە پەسوێ، پێشوازی کرام و ئاگادارم کردن کە جەنابی مەلا مستەفاش

بەرێگەوەیە بۆ ئێرە. زۆری نەبرد مەلا مستەفاش گەیشتە جێ؟ شەو لە دانیشتنەکەماندا مەلا مستەفا رووی کردە ئاغایانی مامەش و پێی ووتن: "ئێمە لەم ولاّتە میوانین، لەسەر کوردایەتی دژ بە رژێمی عێراق راپەڕیوین و شەڕمان لەگەڵدا کردووە. لە ئێرانیش هەر لەسەر کوردایەتی شەهیدێکی زۆرمان داوە. ئێمە نەهاتووینەتە ئێرە کە ولاّتەکەتان لێ داگیر بکەین تا ئێوە بە فیتی ئێران بەرەنگاری و دژمان بوەستن. ئایا ئەم حکومەتە چ رێز و نرخێکی بە کوردی ئێران داوە؟ چما وا بە سووک و رەزیلی لە بن دەستی فارساندا مل کەچ دەژین؟ لە بری ئەوەی کە پارێزگاریمان بکەن کەچی بیستوومانە نیازی پەلاماردانی ئەو ماڵە بارزانی‌یانەتان هەیە کە لە نێوچەکە دان، ئایا بیرتان لەوە نەکردووەتەوە کە ئەو کارە گەلێک بە گران لەسەرتان دەکەوێت؟ ئایا ئێوە نازانن کە گۆشتی ئێمە زۆر تاڵە؟ هەروەها ئەوەشتان بە یاد دێنمەوە کە هەر لە سەردەمی عوسمانی‌یەکانەوە عەشیرەتی ئێمە و ئێوە دۆستن. ئێستەش ئومێدەوارم کە کارێکی وا نەکەن کە پەشیمانی لە دوا بێت".

پاش ئەوەش ئاغایانی مامەش ئینکاری ئەوەیان کرد و وایان نیشاندا کە هیچ ئاگایەکیان لەو مەسەلەیە نی‌یە و داوای بەخشینیان کرد.

رۆژی دووەم گەڕاینەوە شنۆ، چوومە لای سەرهەنگ، دیتم کە ئەو ماوەیەی ئێمە لەوێ نەبووین دەرفەتی بۆ هەڵکەوتوە کە بە شفرە بروسکەیەک (از راه دریاچەی رضائیە)، بۆ سەرلەشکر بنێرێ، جگە لەوە لە ژوورەکەیدا نەخشەیەکی عەسکەری هەڵواسرابوو، ئیشارەتی بۆ (٦) جێ کردبوو کە هێرشمان بکرێتە سەر، بە تۆپچی‌یەکانم ووت" لە دەرفەتێکدا ئەو نەخشەیەم بۆ بێنن". رۆژی دووەم نەخشەکەیان بۆ هێنام و دەسبەجێ بردمە لای مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد. مەسەلەکەم بۆ روونکردنەوە کە چۆن سوپای ئێران لەو جێیانەوە نیازی پەلاماردانی هەیە بۆ سەرمان، بۆیە من وام بە چاک زانی کە بەزووترین کات ماڵ و منداڵ بگەیەنینە مەرگەوەڕ.

لەگەڵ مەلا مستەفا چووین بۆ لاجان، لە شنۆشەوە دەست کرا بە گواستنەوەی ماڵەکان بۆ کانی سپی و کیلاش، پاشان لەگەڵ مەلا مستەفا چووینە شیناوێ لە دەشتی لاجان، دووای ٢-٣ ڕۆژێک حەمەد ئاغای سەروکانی کە لە خزمانی کاک مامەندی کولیجی بوو نامەیەکی لەسەرهەنگەوە هێنا بۆ مەلا مستەفا، لەوێدا داوای کردبوو کە مەلا مستەفا بچێتە پەسوێ و چاویان بەیەکدی بکەوێ، بەڵام بە هیچ جۆرێک ڕەئیس بەکری لەگەڵدا نەبێت، چونکە دژ بەرێککەوتنەو کابرایەکی شەڕخوازە. هەروەها تکاشی لەمەلا مستەفا کردبوو کە ئەو نامەیە پێشانی من نەدات، پاش خوێندنەوەی مەلا مستەفا بە پێکەنینەوە نامەکەی دامێ و ووتی: دیارە سەرهەنگ تۆی گەلێک خۆش دەوێ بۆیە وا پەستت دەکات. پاش ئەوەی کە منیش نامەکەم خوێندەوە بە مەلا مستەفام ووت، پێ دەچێت کە سەرهەنگ پیلانێکی باشی بە دەستەوە بێت بەرامبەرت، دیارە کە هەر بە فرت و فێڵ دەیانەوێ وەک هەمیشە گەورە پیاوانی کورد لە نێو بەرن، بەڵام گەوجن و نازانن کە ئەو فێڵ کردنە لە ئێوە ناکرێت، جگە لەوە سەرهەنگ هێندە مرۆیەکی مەزن نی‌یە کە بەرێزتان بچنە لای. با سەرهەنگ بفەرموێ و بێتە ئێرە و هەرچی لە هەمبانەکەیدایە هەڵیرێژێت.

دوواتر مەلا مستەفا وەڵامی نامەکەی دایەوە و بۆی نووسی کە ئەو کاری پێی هەیە بێتە ئێرە و بیبینێ، دواتر بۆمان ئاشکرا بوو کە ئێران بەردەوام هەوڵی هەڵفریواندنی ئاغایانی مامەشی داوە بۆ لێدانمان. لەبەر ئەوە مەلا مستەفا وای بە چاک زانی تا خۆمان بپارێزین و لە نێوچەکە دەربچین چەک بە مامەشان نەهێڵین، لەو بارەشەوە چوومە لای شێخ ئەحمەد کە مۆڵەتی لێ وەربگرم بۆ هەڵسوڕاندنی ئەو کارە. پاش ئەوەی کە مۆڵەتم وەرگرت، چەند چەکدارێکی دیکەی بارزانیشم لە شنۆوە لەگەڵ خۆم برد بۆ شیناوێ، مەلا مستەفا خۆی گەڕایەوە شنۆ و شێخ محەمەد خالدی شێخ ئەحمەدیش لە شیناوێ مایەوە. (٢٢) گوندی مامەشمان دیاری کرد کە چەکداری ئەوانی تێدابوو، کە لە یەک ڕۆژدا چەک بکرێن، دەمانزانی کە هەر گوندی

چەند چەکـداری تێـدایە، لەبەر ئەوە بۆ هەر گـوندێک دوو هێندەی ئەوان چەکـداری بارزانیم دەنارد نەوەک چەکـدارانی مـامـەش دەست بکەنەوە و مەرگەسەری دروست ببێت. ئاگاداری چەکدارەکانی خۆمانم کرد کە:

١- لە کاتژمێری ١٢ی نیوەڕۆدا دەست بە چەک کردنیان بکرێت.

٢- بە هیچ جۆرێک دەست لەماڵ و منالّی کەس نەدرێت.

٣- لەو کاتەدا هاتوچۆی نێوان گوندەکان قەدەغە بکرێت.

خـۆم چوومـە گـوندی پەسـوێ. کـاک جـەلال ئـەمـینم نارده گـوندی دریکە (گـوندی مـارف ئاغـای برای حـاجی قـەرەنی ئاغـا بوو). سـەعـیـد ئەولا بەگیشم نارده گوندی سێلّوێ (گوندی مام حوسێنی برای حاجی قەرەنی ئاغا). بەم چەشنە بۆ هەر گوندێ لێپرسراوێکم نارد.

## ڕووداوە دڵتەزێنەکەی سێڵوێ

ڕەنگ هەیە کە گەلێک کەس چ کاتی خۆی و چ ئێستاش وا تێگەیشتبن کە بارزانی‌یەکان لە پێناوی تەماعکاری و تۆڵە سەندنەوە، ئاغاکانی سێڵوێیان کوشتبێ، نەخێر، ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە هیچ جۆرە پەیوەندی‌یەکی بەو هۆیانەی سەرەوە نی‌یە، بەڵکو ڕووداوێکی بە سەهووی کتوپڕ بوو لە هەردوو لایەنەکەوە.

هاوکات لەگەڵ چوونی بارزانی بۆ سێڵوێ، ١٢-١٣ کەس لە ئاغایانی مامەش، برازا و خزمانی مام حوسێن ئاغا؛ لە سێڵوێ داوەت دەبن. واتە لەو ڕۆژەدا وا ڕێک دەکەوێت کە خەڵکێکی زۆر (لە بارزانی‌یەکان و هی دیکەش) لەوێ دەبن، وە لە هەمان ڕۆژدا کۆمەڵێک بارزانی دیکەش دەگەنە ئەوێ. میرزا ئاغا ڕەسووڵ نێوێک لەگەڵ (٥) بارزانی‌دا پێش نان خواردنی نیوەڕۆ دەچنە دیوەخان و مام حوسێن ئاغا و خزمانیشی لەوێ دەبن، پاش دەقیقەیەک یەکێک لە خزمەتچی‌یەکان دەچێتە ژووری و بە نهێنی بە گوێی مام حوسێن ئاغادا دەچرپێنێ کە خواردن ئامادەیە، بەڵام کەمە و بەشی هەمووی ناکات لەبەر ئەوەی کۆمەڵێ بارزانی دیکە هاتوون، ئەوجا خواردنەکە دوا بخرێت تا هی دیکەش لێدەنرێت یان نا؟ مام حوسێن ئاغاش پێی دەڵێت کە پێویست ناکات، بەڵکو بە دەستوبردی هەندێک خورما و ڕۆنیش بکرێت و لەگەڵ خورادنەکەدا دابنرێت. بەڵام مەخابن بارزانی‌یەکان لەو چرپە چرپە وا تێدەگەن کە مەبەستێکی خراپیان هەیە و دەیانەوێ دەستیان لێ بکەنەوە و بۆیە بە گورجی هەر زوو مام حوسێن پێیان دەڵێ کە چەکەکان لە خەڵوەتی دان (ژوورێکی گچکە بوو لە ناو دیوەخانەکاندا و دەرگاکەی بەسەر دیوەخانەکانەوە بوو، چەکی میوانان لەوێ دادەنرا)و وەریبگرن. جا بارزانی‌یەکان هاواریان لێ دەکەنەوە کە دمانچەکانیشیان دابنێن، لەو دەمەدا سولەیمان خانی مام حوسێن ئاغا دەپەشۆکێ و لە بری ئەوەی کە دەمانچەکەی بە قایش و بەرگەوە بکاتەوە،

تەنێ دەمـانچـەکـەی بە ڕووتی دەردێنێ، بارزانی‌یەکـانیش وا دەزانن کـە سـولەیمان خـان دەیەوێ بیـانکوژێ. ئەم لە یەک نەگـەیشتن و سـەهو بردنە دەبێتە هۆی دەست کردنەوەی بارزانی‌یەکان و لە ئەنجامدا دوو بارزانی و هەمـوو ئاغـاکانی ناو ژوورەکە دەکوژرێن، تەنێ یەکێکیان نەبێت (فەتاح شیتە) نێـویک کە تاقانەی دایک و باوکی دەبێت و ئەویش دەکەوێتە ژێر لاشەکانەوە، بارزانی‌یەک کە نێوی (حال) بوو دەیبینێت کە دەجوولێتەوە و دەیەوێ بیکوژێ، فەتاح هاوار دەکات و دەڵێت خوام خستە بەربەختی مەلا مستەفا، ئەوجا (حال) دەست دەکشێنێتەوە و نایکوژێت. ئەمە راستی ڕووداوەکە بوو.

لە گوندی پەسوێ عەلی حاجی قەرەنی ئاغا و دوو ئامۆزای لەوێ بوون، چەکم کـردن، (١٣) تفـەنگ و (٦) دەمـانچـەو (٤) وڵاغی سـواریان لێ سەندرا، ئەوجا گەڕامەوە شیناوێ، نامەیەکم بۆ کاک جەلال ئەمین نووسی کە لە دریکە گەڕایەوە عەلی ئاغا و ئامۆزاکانی بۆ شنۆ بەرێ بکات و ئەوجا بێتە لام بۆ شیناوێ.

ئەو (فەتاح شیتە)ی کە لە سێڵوێ بە سەلامەتی رزگاری ببوو، هێنایانە شیناوێ. لەوێ لەوەزعێکی گەلێک پەرێشان و شڵەژاویدا بوو، لە شی بە خوێنی مێشکی کوژراوەکان سوور ببوو. ناردمەماڵی مەلای گوند کە جل و بەرگی بگۆڕن و لەوێ پشـوو بدات. ڕۆژی دووەم هێنامـەوە لای خـۆم و گەلێکم دڵ دایەوە، ڕووداوەکەی وەک لە سەرەوە باسم کرد، بێ کەم و زیاد بۆ گێڕامەوە و گەلێک خەفەت و مەینەتی پێداین و مەخابن تازە کار لە کار ترازابوو.

گەڕامەوە شنۆو داوام لە شێخ ئەحمەد کرد کە نامەیەکی سەرەخۆشی بۆ سەرۆکانی مامەش بنێرێ و پەرۆش بوون و نارەزایی خۆی لەو ڕووداوە دڵ تەزێنە دەرببڕێ. جەنابی شێخ نامەکەی بۆ ناردن و ئەوەشی بۆ نووسیبوون کە بەو ڕووداوە نارەحەت و دڵتەنگ بوو.

عەلی ئاغا و دوو ئامۆزاکەی لە شنۆ بەند کران، واش ڕێک کەوت کە

لەو ماوەیەدا شەڕێک لە نێوان بارزانی‌یەکان و سوپای ئێراندا رووی دا. ساکۆکانی لە نجی فەوجێکی ئێرانیانی بە دیل گرتبوو کە ۳۲ ئەفسەریان لەگەڵ دابوو عەلێی ئاغا و ئامۆزاکانیشی لەگەڵ ئەوانەدا لەو خانوەدا بوون کە وەختی خۆی سمایل ئاغای لێ شەهید کرابوو. عەلی ئاغا وەڵامی بۆ ناردم کە لەو جێگەیە نارەحەتە، منیش لەوێ لام برد و پاشان گەڕایەوە ناو عەشیرەتەکەی خۆی.

زۆری پێ نەچوو حکومەتی ئێران هێرشی کردینەوە سەر بۆ شنۆ و هەموو عەشیرەتی مامەشی لەگەڵدا بوو. عەلی ئاغای حاجی قەرەنی ئاغا نامەیەکی بە نهێنی بۆ ناردم کە تێیدا نوسیبوو: "نامانەوێ شەڕ دژی بارزانی‌یەکان بکەین. سەرلەشکر بە زۆر ئێمەی هێناوە، بە تایبەتی جێگەیەک کە تۆی لێ بێت تەلاقمان دەکەوێت گەر تەقەی لێ بکەین، چونکە ئێوە بوونە هۆی نەکوشتنی من و ئامۆزاکانم لە شنۆ، ئەو چاکەیە هەرگیز لە بیر ناکەین، لەبەر ئەوە چەند تەقەیەکمان لێ بکەن تا ئێمە بکشێینەوە". لە راستیشدا هەر وابوو ئەوان شەڕیان نەکرد، بەڵام ئاغایانی مەنگوڕ، عەولای بایز پاشا، هەمزەی ئەسلان و تاقمەکەیان هێرشیان بردە سەر بارزانی‌یەکانی دەوروبەری شنۆ و لە ئەنجامدا شکێندران و هەمزەی ئەسلان و چەند کەسێکیان لێ کوژرا و بریندار کرا. پاش ئەوە من و مەلا مستەفا چووینە مەرگەوەڕ، فڕۆکەی ئێران شنۆی بۆمباباران کرد و شەڕ دەستی پێکرد. گەڕامەوە شنۆ و ئەو ئەفسەرانەی کە لە شەڕی (نەلومی) بە دیل گیرابوون بردمن بۆ مەرگەوەڕ و سەربازە دیلەکان بەردران.

## هەواڵی دڵتەزێنی لە سێدارەدانی پێشەوا

رۆژی ١٩٤٧/٤/٢ فـرۆکـەیەکی ئێـرانی بڵاوکـراوەیەکی بەسـەر مـەرگـەوەڕدا بەردایەوە، ئەو هەواڵە دڵتـەزێنەی تێـدابوو کـە لە ١٩٤٧/٣/٣١دا پێشەوای نەمر قازی محەمەد، حەمە حوسێن خان و سەدری قازی لە سێدارە دراون.

پاش ئەم هەواڵە جەرگبڕە بە چەند رۆژێک مەلا مستەفا هاتە لام بۆ ماڵەوەو فەرمووی کە بچینە خزمەت سەید عەبدوڵا ئەفەندی نەهری و بیروڕای وەربگرین لە دامەزراندنی حکومەتی کاتی بە سەرکردایەتی ئەو. چووینە خزمەتی، لەوێ مەلا مستەفا داوای لێ کرد کە سەر لە نوێ هەواڵی راگەیاندنی دامەزراندنی کۆمار بە سەرکردایەتی سەید عەبدوڵا ئەفەندی بە جەماوەری کورد بگەیەنین. بەڵام وەڵامی بەڕێز سەید عەبدوڵا بەم جۆرە بوو:

"مەلا مستەفا، ئەوە شەرەفێکی گەلێک گەورەیە کە ئەو داوایەم لێ دەکەن، ئاشکرایە کە بنەماڵەی ئێمە هەموویان لە رێی خزمەتکردن بە کورد و کوردایەتی گیانی خۆیان لە دەست داوە. خۆزگە کە ئێستە من لە تەمەنی ئەم بەکـرەدا دەبووم و ئەو شـەرەفـەم دەست بکەوتایە کـە سـەربازێکی کوردستان بوایام و لەگەڵ ئێوەدا بەشداریم لە شەڕ دا بکردایە نەک بوومایە بە سەرکۆمار، بەڵام دەبینیت کە وەزعم چۆنە، پیر و بێ هێز و پەککەوتەم و دەبمە بار بەسەرتانەوە، خۆزگە بم توانیبایە لە خەباتی بارزانییەکاندا بەشداریم بکردایە، بەڵام مەخابن، ئەوە حاڵی جەستەمە و سەرکۆماریش هەر لایەق بە شێخ ئەحمەدە". ئەوە بوو نەمانتوانی ئەو مەبەستە کە بۆی چووبووین لەگەڵ جەنابی سەید عەبدوڵای نەهریدا بە ئەنجام بگەیەنین.

ئەو ئەفسەر و سەربازانەی کە دیل بوون لامان نەمانتوانی زێتر بە

خێویان بکەین، لەبەر ئەوە هەموویانمان ئازاد کرد، تەنێ ئەفسەرێک نەبێت کە کوڕی سەرلەشکری بەختیاری بوو، گلمان دایەوە تا گەیشتینە سەر گادەر، ئەوجا لەوێوە ناردمانەوە بۆ لای سەید عەبدوڵای نەهری کە بیداتەوە دەست حکومەتی ئێران.

## شەڕی گوجاری نێوچەی بەگزادان

لەگەڵ مەلا مستەفا و (١٣) بارزانیدا شەو لە مەرگەوەڕەوە چووینە گوندی ڕاژانە بەو نیازەی کە لەوێوە بچینە تەرگەوەڕ، محەمەد حوسێنی سەرۆکی هەرکی سەیدە و مامۆستا محەمەد وردیشمان لەگەڵدا بوون. لە ڕاستیدا ئەم سەفەرەم گەلێک پێ ناخۆش بوو و لەو بارەیەوە بە مەلا مستەفام گوت: "ئەم سەفەرەمان بەو ژمارە چەکدارە کەمەوە بۆ تەرگەوەڕ بە چاک نازانم، بەتایبەتی عەشیرەتەکانی ئەوێ زۆر جێی باوەڕ نین و ئەگەر ژمارەیەکی باش چەکدارمان لەگەڵدابێت پێم وانیە بوێرن کارێکی خراپمان لەگەڵدا بکەن، بە پێچەوانەوە دوور نییە کە ئێستە زەفەرمان پێ ببەن، بەتایبەتی ئەوڕۆ، کە هەر عەشیرەتە و هەوڵی ئەوە دەدات کە حکومەتی ئێران لە خۆی ڕازی بکات". بەڵام مەخابن مەلا مستەفا هەر سوور بوو لەسەر ڕۆیشتنمان بۆ تەرگەوەڕ و فەرمووی:

"ئەسعەد خۆشەوی ئێستە لەوێ لای ڕەشید هەرکییە لە نێوچەی هەرکییان و ئاگاداری چونەکەمانە بۆ تەرگەوەڕ، جگە لەوەش خزمایەتیشی لەگەڵ نووری بەگی بەگزادە پەیدا کردووەو ژنێکی خزمی ئەوی هێناوە و گومانی خراپەیان لێ ناکەم، ئەوجا کە ئەو شوێنەمان زامن کرد ئەوا دەتوانین خەڵکەکە بۆ ئەو نێوچانە بگوێزینەوە و نیزیکی نێوچەی شکاک ببینەوە. ئەوەی کە گومانی لێ بکرێ تەنێ ئەمەر خانی شکاکە، بەڵام تایەر خانی کوڕی سمکۆی شکاک لەگەڵ ئێمەیە. لەوێش بەدواوە نێوچەی جەلالیانە کە نیازمان هەیە بچینە ئەوێ و ئەوانیش دۆستمانن.

ڕۆژی دواتر بەرەو تەرگەوەڕ کەوتینە ڕێ. لە نیزیک ڕووباری بەردەسۆر گوندی سلیڤانەمان هاتەڕێ. چوار ئاغا خاوەنی ئەم گوندە بوون و بە خۆیان و چەکدارەکانیانەوە چووبونە پاڵ حکومەتی ئێران. ئێواری گەیشتینە گوندی گوجار – دەکەوێتە دەشتی تەرگەوەڕ – لەماڵی سەید نورالدین بووینە میوان. پاش نان خواردنی ئێوارە، سەید نورالدین رووی کردە مەلا

مستەفا و پێی ووت: "جەنابی مەلا مستەفا، ئەوڕۆکە پیرۆزترین رۆژی ژیانمە کە جەنابتان تەشریفتان هێناوەتە ئێرە، و خۆم گەلێک بە بەختەوەر دەزانم کە شەرەفی میواندارێتی ئێوەم پێ برا، لە هەمان کاتدا دەمەوێ ئەوەتان پێشکەش بکەم کە پێویست نەبوو جەنابت بەم ژمارە کەمە چەکدارەوە بێیتە نێو عەشیرەتی بەگزادە، جەنابت نایان ناسیت کە ئەمانە چەندە بێ بارن. من خەڵکی مەرگەوەڕ نیم بەڵام لەمێژە کەوتوومەتە ئێرە، ئەم عەشیرەتە گەلێک نامەردییان لێ چاوەڕوان دەکرێ، هەر بۆ سەلماندنی ئەم قسانەم نموونەیەکی گچکەتان بۆ دێنمەوە، لەسەردەمی خۆیدا خێزانی سمایل ئاغای شکاک بێرەدا تێپەڕ دەبێت، هەرچی دەبینێت بە تاڵان دەیبەن و رووتی دەکەنەوە، تا ئەوڕۆش خشڵ و زێڕی ئەو خێزانە بە بەرۆکی ژن و منداڵی نوری بەگەوەن. ئەوجا کەسێک کە ویژدانی هێندە بڕ بکات ژنێک رووت بکاتەوە ئاخۆ دەبێت چ جۆرە مرۆڤێک بێت. ئایا پێناچێت کە ئەو کەسانە هەموو جۆرە تاوان و خیانەتێکیان لێ بوەشێتەوە؟ بۆیە پێوست بوو جەنابتان بە (١٠٠-٢٠٠) چەکدارەوە بەم نێوچەدا تێپەڕ بوونایە. ئێستەش ئەگەر بە قسەی بچووکی خۆتان دەکەن هەر ئەم شەو بەرەو دوواوە بگەڕێنەوە و بە هێزێکی چەکداری زۆرەوە وەرنەوە، دەنا نوری بەگ هیچ جێی متمانە نییە و لەگەڵ ئێرانە و خیانەتتان لێ دەکات".

لەوەڵامدا مەلا مستەفا پێی ووت" گەر ئەو کابرایە عەقڵی هەبێت ئەوا دەزانێت کە ئێمە کێین و خۆی لە قەرەی بارزانیان نادات. ئێمە نەهاتووین وڵاتی ئەو داگیر بکەین، بەڵکو رێبوارین و لێرەوە تێ دەپەڕین". زۆر بەسەر ئەم وتوێژەدا تێ نەپەڕیبوو، تەتەرێک خۆی کرد بە ژوورا و نامەیەکی لە لایەن نوری بەگەوە بۆ مەلا مستەفا هێنابوو. نوری بەگ لە نامەکەیدا نووسیبووی: "بە هیچ جۆرێک قەبووڵ ناکەم بێیتە خاکی ئێمەوە، دەبێ هەر ئەمشەو گوجار بەجێ بێڵن، خۆ ئەگەر نا بە زۆری هێز دەرتان دەکەم". بەو هەواڵە مەلا مستەفا دەماری گرژ بوو، دەستوبرد وەڵامێکی ئامۆژگاری و لە هەمان کاتدا هەڕەشەی بۆ نووسیەوە و بە

بەحری بەگدا (هەڵاتوویەکی کوردستانی تورکیا و لەگەڵ هەرکییەکان بوو) بۆی نارد.

بەحری بەگ دەگاتە رۆخی ئاوایی (ئەمین) کە ماڵی نوری بەگی لێیە، بەر لەوەی بگاتە نێو گوند دەستڕێژی تفەنگی لێ دەکەن، بەڵام خۆشبەختانە بەرناکەوێت و بە غاردان بەرەو دوا دەگەڕێتەوە، تەنانەت زینی ئەسپەکەشی لێ کەوتبوو و بەبێ زین گەڕابۆوە.

لە هەمان کاتدا لەسەر سێ بەرزایی لە دوورەوەی گوجار ئاگر کرابۆوە، دیار بوو کە چەکدارەکانی نوری بەگ بوون و لەوێ خۆیان دامەزراندبوو، و ئابلۆقەی گوجاریان دابوو.

منیش بە پەلە چەکدارەکانی کە لەگەڵمدا بوون لە ٢-٣ جێگەی (١٠٠-١٢٠م) لە دەرەوەی گوندەکەم دامەزراندن و لە خانوویەکی بەرزی نێو گوندەکەش دوو چەکدارێکم دامەزراند. ئەوی دی کەماوینەوە: من، مەلا مستەفا، حوسێن فاتێ، عەزیز قالەرەش، لەگەڵ محەمەد حوسێن هەرکی سەیدە لەماڵی سەید نوریماینەوە تا دونیاش رۆشن بۆوە، ئەوجا بە سواری لە ئاواییەکە ١٠٠ مەترێک، بەرەو گەلی بەردە سۆر دوور کەوتینەوە. لە ناکاو تەقە لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکرد، دوو سواری بەگزادە بە پرتاو هێرشیان هێنایە سەرمان و هاواریان دەکرد: (نەحەلی، نەحەلی مەلا مستەفا ئەز هورکووی بەگزادەم پێ دەڵێن، ئەورۆ رۆژی مێرانە) ئێمەش ناچار بووین کە تەقەیان لێ بکەین و هەردوو سوارەکەمان پێکا. نیو سەعاتێک لەو جێگەیە ماینەوە و بەردەوام هێرشمان دەکرایە سەر، ئێمەش بەردەوام دەمان شکاندنەوە. لەم هێنان و بردنەدا بووین، محەمەد حوسێن هەرکی رووی لەمەلا مستەفا کرد و پێی گوت: "مەلا مستەفا مانەوەت لێرە باش نییە، ئێمە گەلێکمان شەڕ لەگەڵ ئەم عەشیرەتەدا کردووە و شارەزاشیانین لەبەر ئەوە وریا بە، خۆت بگەینە گەلی بەردە سۆر کە تەنێ رێگەیە لێوەی دەرباز بیت، خۆ ئەگەر بێت و نوری بەگ و چەکدارەکانی لە لای گوندی کۆیە و بەلای چیاکانی بەرەو تورکیاوە بێن

و ئەو نێــوچەیە بگرن ئەوا بە هیچ جـۆرێک رزگــارتان نابێت، ئێســتــە تەنانەت منیشت لەگەڵ نەمـاوم چونکە قـادۆی کـورم بە (١٥٠) کـەسـەوە چووتە پاڵ عـەجـەم، لەبەر ئەوە هیچ شـەرمی تێـدا نیـە گـەر بە پەلە خـۆت بگەیەنیـتە گـەلی بەردە سۆر". لەو کـاتەدا ئەسعـەد خۆشەوی لەگەڵ شەش کەسدا گەیشتە لامـان، دیار بوو کە لە نیزیک ماڵە خەزوورانی بوو هەستی کردبوو کە پەلاماری دەدەن، خۆی رزگار کردبوو، مەلا مستەفا کەمێک لێی توورە بوو، کە بۆچی ئەو ٣-٤ منداڵەی لەگەڵ دایە. مەلا مستـەفا ویستی هێرشیـان پێ بکات بەڵام لای خۆمـانمان هێشـتنەوە تا ئەوانەی نێو گـوندی گوجاریش دەگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی لە کشانەوەیاندا لـە پشتەوە بیـان پارێزین و ئەو دەم بەرەو گەلی بەردە سۆر بڕۆین.

ئەو شـوێنـانەی کـەمحـەمەد حوسـێن پێی ووتین، بە دووربین تەمـاشـامـان دەکرد، دیتـمـان سـوارێکی زۆر بەرەو گـەلی بەردە سـۆر دێن تاپشـتـمـان لێ بگرن، ئێمەش بە پەلە و پڕتاو (من، مـەلا مستەفا، حوسێن فاتێ و عەزیز قالە رەش) بەرەو گەلییەکە چووین.

ئەسپـەکەی من لەوانی دیکە بە تینتر بوو، بەر لەوان گـەیشـتـمە نیـزیکی سـەر لووتکەی گـەلییەکە، لە ئەسپـەکـەم دابەزیم و بە ٣-٤ دەقیـقـە خـۆم گـەیاندە نیــزیکی سـەر گـەلییەکـە، بارانێکی زۆریش دەباری و کـرێوەی دەکرد، لە دوورەوە هەندێ کەسم دیت کە بەرەو سەر گەلی دێن، سەرەتا وام هەست کرد کە بارزانییەکانن و لە گوندی گوجارەوە دێن، بەڵام هەر هێندەم زانی دەســـتـــرێژێکی گـــوللەم بۆ هات، زوو خـــۆم بە زەوی دادا و کـــەتمە تەقـەکردن، زۆری پێ نەچوو مـەلا مسـتـەفـا و حوسێن فـاتەش سـەرکەوتنە سـەر گەلییەکە، هەر یەکەیان بەدرێژایی ٣٠ مـەترێک لە چەپ و راسـتی منەوە خۆیان دامەزراند و کەوتینە شەڕ، لە هەمـان کـاتدا عـەزیز قـالەرەشم بەرەو مــەرگــەوەڕ نارد، کـــە هەرچی بارزانـییەکی تووش دەبێت بە پەلـە فریامـان بخات. تاکو دوای نیـوەڕۆ شەڕ بەردەوام بوو، پاشان مـەلا مستـەفا رووی وەرچەرخـاند و پێی ووتم کە بەرامـبـەری ئەو تەقـە نەمـا، منیش پێم

ووت کـه بەرامـبـەری منیش تەنێ دەنگی سێ تیـرێک دێت کـه ئەویش گـوللەکـانی زۆر به بڵندی بەسـەرمـانا دەڕوات. فـەرمـووی گـەر کـەسی دیکەمـان لا بوایە ئەوە لەو شـانەی دیکەوە هێـرشـمـان دەبردە سـەریان، پێم ووتەوە کـه من و حـوسـێن له دەسـتی راسـتـەوە هێـرش دەبەین و تۆش له جێگەی خۆت مەجوڵێ و ئەو جێگەیەمان به گولله بۆ داگره تاکو خۆمانی لێ نزیک دەکەینەوە. بەرەو سەنگەرەکـانیـان رۆیشـتین، کـه گـەیشـتـینه نیزیکیان، دیتمان چۆڵیان کردووە و بەرەو گوندی کۆیی کشاونەتەوە، بەڵام له دوورەوە تەقـەیان دەکـرد و لەو نێـوەشـدا هەندێک خـوێن رژابوو و پێ دەچوو که برینداریشیان بووبێت. دەمەو ئێوارە بوو، (عومەر تیلی) نێوێک به خۆی و شەش بارزانییەوە گەیشتنه لامان، هەر زوو مەلا مستەفا پێی ووتن که ئێمه ماندووین و نۆرەی ئەوانه سەنگەر بگرن و ئێمەش لەسەرخۆ به دوایاندا دەڕۆین.

بۆ ئێـواری گـەیشـتـینه سـەر ئەو بەرزاییـەی کـه بەسـەر گـوندی کـۆیی‌دا دەیڕوانی تەقـەمـان بەسـەر گـوندەکـەدا کـرد، بەڵام هیچ دەنگێکی تەقـەی دوژمنمـان گوێ لێ نەبوو. چووینه نێو گوندەکه کەسی تێدا نەمابوو، تەنێ پیـرێژنێک نەبێت، پێی ووتین کـه چوار کـوژراویان هەبووە و بردوویانەته دەرەوەی گوندەکه.

ئەو شەوە لەوێ ماینەوە، و بۆ بەیانی چەند بارزانی‌یەکی دیکه گەیشتنه لامان و ئەوانەی که له گوندی گوجاریش بوون لەگەڵ حەمەدەمین میرخان گەیشتنەوە لامان.

زیانمان له گوندی گوجار، دوو شەهید بوو، (حاجی محەمەد هوستانی، شەوالی شندو) برینداریشمان ٣ کەس بوو (مستەفا رەشۆ، حال محەمەد و حەسۆ میرخان). ژمارەمان بوو به (٣٨) کەس، شەو و رۆژێک له کۆیی ماینەوە، بۆ رۆژی پاشتر هەرچی هێزی بەگزادە هەیە به ستونێکی ئێرانی و(٣) تانک هێرشیان هێنایه سەرمان، فڕۆکەشمان بەسەرەوە بوو، تا ئێوارە بۆمبابارانیان کردین و شەڕ رانەوەستا، له هەمان کاتدا هەواڵمان بۆ

هات کە ستونێکی ئێرانی دیکەش لە ورمێوە بەرەو گەلی بەندێ چووە بەو نیازەی کە پشتمان لێ بگرن. ناچار کە شەو هات بەرەو مەرگەوەڕ کشاینەوە دوواوە بۆ (دزی مەرگەوەڕ). هێزەکانی ئێران بە (٢) هەنگ (لیوا)ی سوارە بەرەو مەرگەوەڕ هاتن، ئێمەش هێزەکانی خۆمان لە دوو لای نێوچەکە دامەزراند، بەشێک لە گوندی ئەورس کە بە پاڵ چیای سنووری مەرگەوەڕەوە بوو و بەرەو ڕێگەی نەهرێ دەچوو. بەشەکەی دیکەشمان بەگردو تەپۆڵکەکانی (جەلکان و مەمکان)ی نێوان مەرگەوەڕ و ورمێ.

خۆشم چووم بۆ شنۆ و یەک لە تۆپەکانمان کە لەوێ بوو لەگەڵ خۆمم هێنا بۆ مەرگەوەڕ. سوپای ئێرانی تا ناوەڕاستی دەشتی مەرگەوەڕ هات، هەستی کرد کە لە دوو لاوە هێزی ئێمەی لێیە، پتر نەهاتە پێشەوە. لە ماوەی سێ کاتژمێر ڕێ، لە دوورەوەی (دزی)یەوە خۆیان دامەزراند و دەستیان بە تۆپ باران کردنی دەوروبەر کرد، ئێمەش لە جەلکان و مەمکانەوە چەند گوللە تۆپێکمان تێگرتن و کە شەو دادەهات بە ٦-٧ کاتژمێرێک ڕۆیشتن تۆپەکانمان دەبردە (ئەورس)و بۆ ڕۆژی دووەم لەوێوە گوللە بارانمان دەکردن تا وا هەست بکەن کە لە هەردوو لای جەبهەکەوە تۆپمان هەیە.

پاش ڕوخانی حکومەتی تەورێز، (٤) ئەفسەری حیزبی تودە (ئازەربایجان) هەڵاتبوونە لای ئێمە، سەروان ڕەئیس دانا، مولازم کەمالی، مولازم فاتمی و مولازم یەعقوبی، سەروان دانامان لەسەر تۆپەکە دانا، چونکە خۆی تۆپچی بوو. نزیکەی (٥٠) گوللەمابوو، تۆپەکە جیهازی تەوجیهی و نازمی نەمابوو، بەڵام هەر کەڵکی لێ وەردەگیرا.

سەروان دانا ٣-٤ تۆپی هاویشتە سەر هێزەکانی دوژمن، بەڵام هیچ دیاری نەدا کە لە کوێ دەکەون چوومە سەرتۆپەکە و وام دەزانی کە سەرقاپاغی گوللەکانی لانەبردووە بۆیە وا ناتەقن. بەڵام وانەبوو، بەڵکو سەرەکانیان لەسەر لاچووبوو، ئەوجا وا دیارە کە لەم حاڵەتەدا گوللەکە دەکەوێتە قووڵاییەک کە دوکەڵەکە لە تەقینی گوللەکە بڵاو دەبێتەوە.

بۆ چارەسەرکردنی مەودا و روو (اتجاه)و نیشان (هەدەف) پێویستە کە نێوچە بەرزەکان یاخود شتێکی دیکە دیاری بکرێت، و رووی تۆپەکەی تێ بکرێت، ئەوجا بە ووردی سووچی (زاویە) نێوان نیشانەکە و جێگەی تەقینی گوللەکە دەست نیشان دەکرێ، و نیشانەی تەواو دانرێتەوە، بەلاّم وا دیار بوو کە سەروان دانا پراکتیکی گەلێک لەسەر تۆپ نەکردبوو و ئەو جۆرە حالّەتانەی نەدیبوو. جێگەیەکم لە نێو لوولەی تۆپەکەوە دەست نیشان کرد و بەرەو دوژمن دەستمان بە تۆپ هاوێشتن کرد، تۆپی دووەم زرمەی لە ئۆردووی دوژمن هەستاند، پاش تەقاندنی ٤-٥ تۆپ زۆر بە پەلە تۆپەکەمان شاردەوە، بەر لەوەی کە فڕۆکەکانی دوژمن جێگەی بدۆزنەوە. پاش تێپەڕینی کاتژمێرێک قادری کوڕی محەمەد حوسێن هەرکی سەیدە، بە خۆی و دوو کەسەوە هاتە لای مەلا مستەفاو پێی ووت: "سەر لە شکر ئێمەی بە زۆر هێناوە بۆ شەڕ، تکام وایە کە تۆپ نەگرنە ئێمە و چەکدارەکانمان، هەر دەرفەتێکمان بۆ بلوێ خۆ دەدزینەوە و شەڕی ئێوە ناکەین".

نێوبراو (١٥٠) چەکداری لەگەڵدا بوو، لێمان پرسی ئایا گوللە تۆپەکان تا چ رادەیەک کاریگەر بوون؟ ووتی: لەسەرەتادا گوللەکان دەکەوتنە چالاّییەکانی دوور لە سەنگەرەکان و فەرماندەی هێزی دوژمن دەیووت: ئەو تۆپچی‌یە یان لەگەڵ ئێمەیە یاخود نەزانە دوای ئەوە گوللە تۆپەکان دەکەوتنە نێو ئۆردوگاکە و یەک لە گوللەکان کەوتە نێو سەنگەرێک، (١٦) سەرباز و سەروانێکی کوشت. ئەو دەمە فەرماندەی هێز (سەرهەنگ) گوتی: ئەمجارە تۆپچی‌یەکەیان گۆڕیوە.

شەڕ لە جەبهەی ئێمە و شنۆ بە سەرکردایەتی شێخ ئەحمەد درێژەی کێشا. سەر لە نوێ گەڕامەوە بۆ شنۆ کە ژمارەیەکی دیکە بارزانی لەگەڵ خۆم بێنم، چونکە زۆربەی زۆری بارزانی‌یەکان لە شنۆ بوون. لەگەڵ شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد چووین بۆ گوندی (گێلاس)، چەکدارێکی زۆری لێ بوو، ژمارەیەکم لەگەڵ خۆم برد بۆ (ئەورس). بەلاّم داخی گرانم بۆ

ڕۆژی دوایی فڕۆکە ئاگربارانی کردین و (١٢) کەسمان لەوانە شەهید بوون لەگەڵ عەبدوڵڵا خۆشناوی قارەمان. وەجدی بەگ کە لە سوریاوە هاتبووە ناو شۆڕش و یەکێک بوو لە بنەماڵەی بەدرخانی‌یەکان بریندار کرا. بە پەلە وەجدی بەگم بردەوە ماڵێ بۆ تیمارکردن. دوای چەند هەفتەیەک بارزانی لە جەبهەی شنۆوە بەرەو سنوری سەری (ئاوی گادەر) کشایەوە، هەروەها ئێمەش لەمەرگەوەڕەوە لە ژێر بۆمبارانی فڕۆکەی دوژمندا بەرەو لای ئەوان کشاینەوە. منداڵەکانی مستەفا خۆشناو کە لە دزی مەرگەوەڕ بەجێ مابوون لەگەڵ منداڵەکانی خۆمدا بردمن بۆ سەر ئاوی گادەر. لەگەڵ ئەو هەموو ماڵ و منداڵە ئاوارەیەدا لە کەناری ڕووباری گادەر بە پەرێشانی لە نێو ئەو بەفر و سەرمایەدا ماینەوە و هێزەکانی ئێرانیش لە پشتەوە ڕێگەی لێ گرتبووین، لەولاشەوە هێزەکانی عێراق بە سەرکردایەتی پۆلیسی عێراق (سەید عەلی حیجاز) خۆیان دژ بە ئێمە دامەزراندبوو. لەسەر ئاوەکەش پردێکی کاتی بۆ هاتوو چۆ کردن دروست کرابوو.

شێخ ئەحمەد بۆ گەڕانەوەی ئەو خەڵکە بۆ خاکی خۆیان ناچار ما پێوەندی لەگەڵ حکومەتی عێراق بکات. ئەوی بیویستبا کە بگەڕێتەوە، لە پردەکە دەپەڕیەوە و چەکەکانی تەسلیم دەکردەوە و لەوێ دەمایەوە.

بڕیار وابوو کە ئەو ژن و منداڵ و پەککەوتانە لەگەڵ شێخ ئەحمەد خۆ تەسلیمی عێراق بکەنەوە و لە هێزی چەکداریش گەر نەیەوێت ئەوا لەگەڵ مەلا مستەفادا بمێنێتەوە.

پاش ئەوە بە مەلا مستەفام ووت لەگەڵ ئەو ژمارە چەکدارەی کە ماوەتەوە هەوڵ بدەین هەر لە گادەرەوە بە کەناری چیاکانی ئێران و تورکیادا بەرەو سنووری ئیران و رووسیا بڕۆین. بەڵام لە وەڵامدا مەلا مستەفا ووتی: "کاتێک کە لە تاران بوو، باڵوێزی (سەفیری) ئەمریکی پەیمانی ئەوەی داوەتێ گەر بێت و بگەڕێنەوە عێراق و تا ماوەیەکی کەم بەرامبەر هێزی عێراقی خۆ ڕاگرن، ئەوا ئەمریکا داوای شەڕ ڕاگرتن لە هەردوو لا دەکات و کارێکی وا دەکات کە حکومەتی بەغدا خودموختاری

به کورد بدات".

مەلا مستەفا باوەڕی تەواوی بەو پەیمانەی ئەمریکا هەبوو، چونکە دەیزانی کە ئەمریکا دەیەوێ لە بازاڕی عێراق و کەنداودا پێشبڕکێتی (منافسە) لەگەڵ ئینگلیز دا بکات و دەست بەسەر نێوچەکەدا بگرێ.

لەو کاتەدا خەیروڵڵا عەبدولکەریم گەلێک نەخۆش بوو، کاک محەمەد ساڵەح ژاژڵەیی و ژمارەیەکی دیکەش لەوێ بوون، لە ناکاو گوللەی تفەنگێک لە دەست یەکێک دەردەچێت و بەر باسکی محەمەد ساڵەح دەکەوێ و برینداری دەکات، لە کاتی خۆ تەسلیم کردنەوەی شێخ ئەحمەد دا، خەیروڵڵاش لەسەر نەقالە دەبێت. مەخابن کە ئەمیش لەگەڵ هاوڕێیانی دیکەدا لە سێدارە دەدرێت.

لە راستیدا من و چەند برادەرێکی دیکە بڕوامان بەو پەیمانەی ئەمریکا نەبوو کە بە مەلا مستەفای دابوو، چونکە دەبوو بگەڕاباینایەتەوە، هەندێک جێگەی چیاو چۆڵ کە هەموو دەور و پشتەکەمان عەشیرەتە خۆ بەدەستەوەدەرەکانی سەر بە هەردوو دووژمنەکانمان حکومەتی عێراق و تورکیاش بوون، ئەمە جگە لەوەی کە ئێرانیش هەر دەهاتەوە سەر سنوور و ئەو دەمە گەلێک زەحمەت دەبوو کە شەڕی (٣) دەوڵەتمان پێ بکرابایە. جا وامان بە چاک زانی کە لەسەر گادەرەوە سنوور بە سنووری تورکیا و ئێران بڕۆین تا دەگەینە سەر ئاوی ئاراس و لەوێوە دەچینە خاکی رووسیا و داوای پەنابەرێتی دەکەین. ئەوجا من و محەمەد قودسی و جەلال ئەمین و چەند چەکدارێکی دیکە کە ژمارەمان (٢٢) کەس بوو لە گادەر پەڕینەوە کوردستانی عێراق، هەروەها بە (٣٠) دینار یەکێکمان بە کرێ گرت کە بۆ شارەزایی رێگەوبان لەگەڵماندا بێت.

پاش رۆیشتنێکی (٣) شەو و رۆژی بەنێو ئەو هەموو بەفرەی چیاکانی سنوردا بێ هیچ خۆراکێک کابرای رێ پیشاندەر و شارەزا رێی لێ تێک چوو. هەر هێندە بە خۆمان زانی کە گەیشتووینەتە سەر شاخەکانی نێوچەی لۆلان کە سەربازخانەی عێراقی تێدابوو. لەوەزعێکی گەلێک شپرزە و بێ

هێز و برسیدا بووین، لەوێ کاک محەممەد قودسی و کاک جەلال ئەمین و چەند کەسێکی دیکە ووتیان کە: "ئیدی هێزی رۆیشتنمان نەماوە و هەر دەمرین، لەبەر ئەوە تەسلیمی لە شکری عێراقی دەبین". من و(٦) کەسی دیکە ماینەوە و بەسەر لووتکەی چیاکەوە بەرەو رۆژهەلات رۆیشتین. (٤) کەس (ئیبراهیم خۆشناو، سەیدە رەواندوزی، عومەر کاولۆکانی) کە ئێوارەی بەسەر داهات لە ئێمە داترازان، چونکە گەلێک لە پێش ئێمەوە دەرۆیشتن. من و واحیدی مام رەزا کۆیی و عەزیزی قالە رەشی کۆیی (بەناوبانگ بە عەزیز لە یلێ) شەو لەسەر چیاکان ماینەوە و تا بەیانی لە نێو ئەو بەفرەدا هاتوو چۆمان دەکرد و ناو بەناویش پشتمان بە یەکتریەوە دەنا و مێزەرەکانی سەرمان بەخۆ دادەدا تا رۆژ دەبۆوە، ئەو رۆژەش بەنێو ئەو چیا و بەفرەدا رۆیشتین و کاتی نیوەرۆ بوو واحیدی مام رەزا هێزی لەبەر براو لە برسان گیانی پاکی دەرچوو. بە ناچاری خۆی و چەکەکەیمان بەجێهێشت. من و کاک عەزیز تا نیزیکی ئێوارە هەر رۆیشتین، ئەو دەمە گەیشتینە سەر ئاقاری دەشتی شنۆ.

لە دامێنی چیا بەفر تواوبۆوە گیاو گوڵ شین ببوو، چەکەکانمان لە بنی تاشە بەردێک لە جێگەیەکیدا شاردەوە کە لە دواییدا بتوانین بیاندۆزینەوە، خۆشمان بەرەو ئەو گوندەی کە لە دەشتایی‌یەک بوو کەوتینە رێ، لە دەرەوەی گوندەکە چەکدارێک بە پیرمانەوە هات و کەوتە پرسیار کردن لێمان کە ووتمان ئێمە گەلێک ماندووین و برسین، جارێ بمانگەیەنێتە نێو گوند تا کەمێک پشوو بدەین ئەو دەمە بەسەرهاتمان باس دەکەین. لەگەڵ چەکدارەکە بەرەو ماڵی کوێخای گوند (سۆفی شوکر) رۆیشتین.

دوای حەسانەوەمان، سۆفی شوکر ووتی: شانستان هەبوو، تا ئەورۆ نیوەرۆش فەوجێک لە سوارەی حکومەت لێرە بوون و پاشان بەرەو گوندێکی دیکە رۆیشتن کە زۆر لێرەوە دوور نییە، فەرمانیشیان داوە کە هەر کەسێک عێراقییەکی بینی دەست بەجێ هەواڵ بگەیەنێتە لە شکر و بە گرتوویی تەسلیمی بکات، ئەگەر نا زۆر بە توندی سزا دەدرێت، بەلام

بڵێم چی موسڵمانێتی‌یە و ئێوەش لێقەوماون و بە خودێ تەسلیمتان ناکەم.

دوای ئەو قسانە هەستا و زۆری پێ نەچوو هاتەوە و کارتێکی پێ بوو لەوێدا نوسرا بوو: "ئەو مرۆڤە منی رزگار کردووە، لە هەر جێ‌یەک بم بێ پەروا بۆی هەیە بێتە لام و بمبێنێ". (ئەو کارتە لە لایەن رەشید عالی گەیلانی‌یەوە پێی درا بوو؛ پاش کودەتاکەی ساڵی ١٩٤١ هەڵاتبوو، ئەو سۆفی شوکرە تا تورکیای بردبوو). دوو رۆژ لە گوندەکە ماینەوە، بە رۆژ دەچووینە ژوورێکی چۆڵ لە گوندەکە و کە شەو دەهات دەگەڕاینەوە دیوەخانەکەی کوێخا تا کەس نەمانبینێ.

پاش ئەو دوو رۆژە ناردمە شنۆ بۆ کڕینی هەندێک خورما و پەنیر و نان و بەرێ کەوتین. چەکەکانمان لە چیا دۆزی‌یەوە و بەرەو سنوور رۆیشتین. کاتژمێر هەشتی ئێوارە بوو بە چیایەکی گەلێک بەرزدا بەرەو گوندی زێوەکە هاتینە خوارەوە، کە بەسەر چۆمی گادەر کەوتین سەگ گەلی گوندەکە پەلاماریان داین، خۆمان کرد بە ماڵێکدا کە بەرێککەوت ماڵی کوێخا برایمی گوندەکە بوو. شایانی باسە عەزیزی قالە رەشی هاوڕێم لە هاتنەکەیدا کاتی خۆی بۆ لای من، لەو ماڵە میوان بوو.

کوێخا برایم خەڵکی رایەت بوو (ئامۆزای مینە عەلی ئاغای رایەت بوو)، کەوتبووە ئەو گوندە ببوە کوێخا، لەو کاتەدا کوێخا لە ناو گوند بوو، خێزانەکەی ئاگرێکی خۆشی لە ماڵەوە کردبۆوە، هەر کە چاویان بە عەزیز کەوت ناسیانەوە و هاتن بە پیری‌یەوە و بەخێرهاتنیان کردین، ئەم گوندە سەر بە حوسێن ئاغای سێڵوێ بوو (لەمەوبەر باسی رووداوە دڵتەزێنەکەی سێڵوێ مان کرد). بەر لەوەی بگەین بە عەزیزم ووت کە لەوێ ئاشکرام نەکات و تا کەس نەمناسێت، بەڵکو وەک برا گەورە فەرمانم بەسەردا بکە و با تۆش لە رێی منەوە گیروگرفتت بۆ دروست نەبێت.

پاش ئەوەی لەبەر ئاگری ماڵی کوێخا گەرم بووینەوە، ناردیان بەدوای کوێخادا، هاتەوە و گەلێکی رێز لێ گرتین، پاشان لەگەڵ عەزیزدا کەوتە

قسـه و باس و ووتی: بەخودێ گـەلێک بە پەرۆش بووین و بیسـتـمان ئەو جەماعەتەی کە لەگەڵ رەئیس بەکر بوون هەریەکە بەلایەکدا چوون و رەئیس بەکریش لە ناو بەفر ماوەتەوە و مردووە (ئەو چوار کەسەی کە لە ئێمە جودا بووبوونەوە بەوێدا تێپەڕ بوون)، چەند کەسێکیشمان بۆ ئەو چیایانە نارد و گەلێکیش گەڕان، بەڵام تەرمەکەیان نەدیتەوە، عەزیز بەم قسانە کەمێک پەشۆکا و هەر پرسیارێکیشیان کە لێ دەکرد دەشێوا و بە چاکی نەیدەتوانی وەڵامیان بداتەوەو جار و باریش ئاوڕێکی لە من دەدایەوە بە تایبەتی کە نێوی منیان دەهێنا. ژن و منداڵەکەی کوێخا هەستیان بەوە کردبوو کە عەزیز لە دانیشتنەکەیدا ئاسایی نییە و زۆر ئاوڕ لە من دەداتەوە. لەبەر ئاگرەکە هەستام و چوومە دەرەوە بەو فێڵەی کە سەرم سووڕ دەخواو پێویستیم بە هەوای دەرەوە هەیە، زۆری پێ نەچوو کـە گـەڕامـەوە و دەبینم کـە هەمـوو بەرزە پێ لەبەرم هەستاون و کوێخا پەلاماری دام و ماچی کردم و ووتی: "حەیفت نەکرد خۆت لە ئێمە ئاشکرا نەکرد، (دار پیر دەبێ جارێک باز لە سەری دەنیشێتەوە)، ئێمە بەختەوەرین کە تۆ رێگەت کەتووەتە ئێرە". دیار بوو پاش چوونە دەرەوەکەم ژنەکانی کوێخا، عەزیزیان سوێند داوە کە بە گـوێرەی ئەو وەسـفانەی بیسـتـوویانە منیـان دیوە کە فـلان کەسم و برا بچووکی عەزیز نیم، پاشان ئەویش ئاشکرای کردبوو.

هەر ئەو شەوە جل و بەرگی نوێیان بۆ ئامادە کردین و ئاویان گەرم کرد و تکایان زۆر کرد کە خۆمان بشۆین و، گەلێکیان خزمەت کردین.

پاش (٣) رۆژ ماڵێ کوێخامان جێهێشت و خۆشی لەگەڵماندا تا سەر چیاکانی بەرامبەر رایەت هات و لەوێوە لە یەکدی جیا بووینەوە، ئەو بەرەو ماڵ و ئێمـەش بەرەو رایەت رۆیشـتین و لە رێگە تووشی دەردە سـەری و تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر هاتین.

هیـوادارم کـە بەسـەرهاتی لەوە و دووا لـە بەشـێکی دیکەدا پێشـکەش بکەم.

# ناوەرۆک

# له چاپکراوەکانی دەزگای ئاراس
# ئەم کتێبانەی خوارەوە بخوێنەوە:

(١) هەڵکەوتی دیریکی لە کوردستاندا. دانانی: حوسێن حوزنی موکریانی.
(٢) سەروا. دانانی: د. عەزیز گەردی.
(٣) ژنی کورد بەستەم دەورە دراوە. دانانی: د. کوردستان موکریانی.
(٤) الحرب الكردية وإنشقاق ١٩٦٤.تأليف: ديڤيد ادامسن وجرجيس فتح الله.
(٥) رحلة الى رجال شجعان في كردستان. تأليف: دانا ادامز شمدت. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٦) جمهورية مهاباد ـ جمهورية ١٩٤٦ الكردية. تأليف: وليم ايغلتن الابن. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٧) كردستان أو الموت. تأليف: رينيه موريس. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٨) كرد وترك وعرب. تأليف: سي.جي. ادموندز. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(٩) طريق في كردستان. تأليف: أي.ام. هاملتن. ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله.
(١٠) ئەدەبی رووسی و کێشەی پاستیرناک. دانانی: د. مارف خەزنەدار.
(١١) لە پێناوی راستی و کورد و خانیدا. دانانی: محەمەدی مەلا کەریم.
(١٢) کۆچی سوور. رۆمانی: حەمە کەریم عارف.
(١٣) مساهمة علماء كردستان في الثقافة الاسلامية. تأليف: محمد زكي حسين.
(١٤) لە کوردستانی عێراقەوە هەتا ئەوبەری چۆمی ئاراس. نووسینی: مورتەزا زەربەخت. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: شەوکەت شێخ یەزدین.
(١٥) فەرهەنگی کوردستان. دانانی: گیوی موکریانی.
(١٦) خاک و کێشەی مان. رۆمان: عەزیزی مەلای رەش.
(١٧) امارة بهدينان الكردية. تأليف: صديق الدملوجي . تقديم: د. عبدالفتاح علي بوتاني.
(١٨) المجتمع البشري لماذا يشبه مستشفى المجانين...؟. تأليف: مسعود محمد.
(١٩) جوایەز. بەرهەمی نۆ شاعیری هەولێری.
(٢٠) نەخشەی رۆنانی رێژەی کار لە زمانی کوردیدا. ئەندازیار د. شێرکۆ بابان.
(٢١) زریزەی زێڕین. دانانی: محەمەد سالح ئیبراهیمی.
(٢٢) شێخ رەزای تاڵەبانی شاعیری گەورەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. دانانی: ئەحمەد تاقانە.
(٢٣) خۆبیوون و شۆڕشی ئاگری. دانانی: رۆهات ئالاکۆم. وەرگێڕانی: شوکور مستەفا.
(٢٤) عەبدورەزاق بەدرخان. دانانی: جەلیلێ جەلیل. گۆڕینی بۆ کوردی باشوور: شوکور مستەفا.
(٢٥) القومية الكردية و د. عبدالله جودت في مطلع القرن العشرين. تأليف: ماليسانژ. ترجمة: شكور مصطفى.
(٢٦) کۆمەڵناسیی گەلی کورد. دانانی: مارتن ڤان برووین سن. وەرگێڕانی: شوکور مستەفا.
(٢٧) هەڵبژاردنەکانی کوردستان. دانانی: بەدران ئەحمەد.
(٢٨) تنوع الكرد في العراق ـ مدخل الي السياسة. تاليف: سامي شورش.
(٢٩) هەڵەبجە ـ کارەساتی کیمیابارانی ساڵی ١٩٨٨. دانانی: هەورامان عەلی توفیق.
(٣٠) گاڵتە بەچەک. رۆمان ـ نووسینی: جێمس ئۆڵدرج. وەرگێڕانی: د. عەزیز گەردی.
(٣١) لە مۆرکە تایبەتییەکانی رێزمانی کوردی. دانانی: د. شێرکۆ بابان.
(٣٢) بەرەو رێزمانی کوردی، بەرەو زمانی نووسین. دانانی: د. شێرکۆ بابان.

(٣٣) نادرنامەی ئەڵماس خانی کەڵهوڕ. ئامادەکردنی: شوکور مستەفا.

(٣٢) بەرەو ڕێزمانی کوردی، بەرەو زمانی نووسین. دانانی: د. شێرکۆ بابان.
(٣٣) نادرنامەی ئەڵماس خانی کەڵهوڕ. ئامادەکردنی: شوکور مستەفا.
(٣٤) نظام الأناضول الشرقية. تاليف: اسماعيل بيشكچي. ترجمة: شكور مصطفى.
(٣٥) سینتاکسی رستەی کوردی. د. کوردستان موکریانی.
(٣٦) فەرهەنگی شارەزوور. کوردی- ئینگلیزی. دانانی: د. شەفیق قەزاز.
(٣٧) الصراعات الدولية. تأليف: محمد احسان رمضان.
(٣٨) مەلا مەحموودی بایەزیدی یەکەمین چیرۆکنووس و پەخشاننووسی کورد. دانانی: د. فەرهاد پیربال.
(٣٩) گێتی زیندەوەر. دانانی: عەلائەدین سەجادی.
(٤٠) مێژووی پەخشانی کوردی. دانانی: عەلائەدین سەجادی.
(٤١) دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی. ئامادەکردنی: شوکور مستەفا.
(٤٢) كردستان ودوامة الحرب. تأليف: محمد احسان رمضان.
(٤٣) ڕۆمانی ڕێگا. دانانی: محەمەد مەولوود مەم.
(٤٤) مقالات حول القضية الكردية. تأليف: فوزي الأتروشي.
(٤٥) حياتي الكردية أو صرخة الشعب الكردي. مذكرات: نورالدين زازا.
(٤٦) بۆ کوردستان. دیوان: هەژار موکریانی.
(٤٧) جنوب كردستان في الدراسات الانثروبولوجية. ترجمة: جرجس فتح الله.
(٤٨) مهد البشرية او الحياة في شرق كردستان. تأليف: دبليو. أي. ويگرام وادگار. تي. أي. ويگرام.
ترجمة: جرجيس فتح الله.
(٤٩) مبحثان على هامش ثورة الشيخ عبيدالله النهري. تأليف: جرجس فتح الله.
(٥٠) أيامي في ثورة كردستان. مذكرات: يونان هرمز.
(٥١) لقاء الكرد واللان في بلاد الباب وشروان. تأليف: جمال رشيد.
(٥٢) ئاوەدانکردنەوەی کوردستان لە ساڵێکدا - چالاکییەکانی کابینەی چوارەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٠دا و پلانەکانی بۆ داهاتوو.
(٥٣) کۆڤاری رووناکی. ئامادەکردن و پێشەکی: د. کوردستان موکریانی.
(٥٤) مێژووی ئەدەبی کوردی. بەرگی یەکەم. دانانی: د. مارف خەزنەدار.
(٥٥) شازادە چکۆلە. ڕۆمانی مێرمنداڵان. نووسینی: سەنت ئێگزوپێری. وەرگێرانی: ئاسۆ عەبدوڵلا حەسەن زادە.
(٥٦) حەمکێ توڤی. دانانی: د. مەسعود کتانی.
(٥٧) حەیران. دانانی: غەفوور مەخمووری
(٥٨) گەشتێک بە کۆماری مەهاباددا. بیرەوەری: رەئیس بەکر عەبدولکەریم حەویزی.

